# بنەماكانی پێڕست و پۆلێن
# لە كتێبخانە و بنكە زانیارییەكاندا

سەرچاوەیەكی تیۆری و پراكتكییە، لە بواری پێڕست و پۆلێندا

لە ڕێگایەوە فێری چۆنییەتی پێڕست و پۆلێن دەبیت، بە ئاسانترین شێوە

**شێرزاد سەعید محەمەد**

**سلێمانی**

٢٠١٠

# بنەماکانی پێڕست و پۆلێن

# لە کتێبخانە و بنکە زانیارییەکاندا


- ❖ نووسەر: شێرزاد سەعید محەمەد
- ❖ بابەت: لێکۆڵینەوە
- ❖ پیتچنی: نووسەر
- ❖ هەڵەچنی: سنەوبەر کەریم
- ❖ نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- ❖ نەخشەسازیی ناوەوە: ڕێبین مەجید
- ❖ سەرپەرشتیاری کتێب: کارزان عەبدوڵڵا
- ❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: (٧٣٦)
- ❖ تیراژ : (٥٠٠) دانە
- ❖ چاپخانە: چاپخانەی کەمال
- ❖ نرخ: ( ٢٥٠٠) دینار
- ❖ ژمارەی سپاردنی (١٢١٤)ی ساڵی ٢٠١٠ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.




## پێشەکی

دوای زیاتر لە (١٨) ساڵ خزمەتکردن لە بواری کتێبخانەو زانیارییەکاندا، بە تایبەتیش لە بواری پێرست و پۆلێنکردندا، دوای ئەوەی لە چەندەها کتێبخانەی کوردستاندا کارمکرد، چ وەك ئەمینداری کتێبخانە یاخود وەك مامۆستا، فێرکردنی زانیاری کتێبخانەو گەیاندنی بە فەرمانبەران و هاوڕێ و هاوکارەکانم لە کتێبخانەکانی کوردستاندا، سەرنجی ئەوەمدا کە گەورەترین کێشە لە فێرنەبوونی زانستی کتێبخانەدا، نەزانین و نەشارەزای بوون بەو سەرچاوانەی کە زانستەکانیان پێنووسراوە، کە زۆربەی سەرچاوەکانی ئەو بوارە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزییە، لەلایەکی تر ئەو زانستانە وەك زانستەکانی تر لە هیچ قۆناغێکی پێش قۆناغی ئەکادیمی ئەم بوارە (مەبەستمان بەشی زانیارییەکان و کتێبخانەیە)، ناخوێندرێت، بۆیە کاتێك کە خوێندکاران لەم بەشە وەردەگیرێن (یاخود ئەو فەرمانبەرانەی بەشداری خولەکانی فێربوونی ئەم زانستە دەکەن) هیچ زانیارییەکی ئەوتۆیان نییە و درەنگ ئەم زانستە وەردەگرن.

بۆیە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەو بوارەدا کاردەکەم بە بەردەوام هەوڵمداوە بابەتی جۆراوجۆرو بەسوود پێشکەش بە هاوڕێیانم و خوێندکارە خۆشەویستەکانم بکەم، چ لە رێگای وتارو لێکۆڵینەوە یاخود لە رێگای سیمینارو کۆنفرانسەکانەوە بێت. یاخود لە رێگای چاپکردنی کتێبەوە بێت.

خوێنەری خۆشەویست: ئەم سەرچاوەیەی بەردەستان، دووەم کارمە لەبواری چاپکردنی کتێب لەبواری زانستی زانیارییەکان و کتێبخانەدا، کە هەوڵی یەکەمم ئامادەکردنی فەرهەنگێك بوو لەو بوارەدا بە ناونیشانی فەرهەنگی (کتێبخانە)، کە بەیەکەم فەرهەنگ دادەنرێت لەو بوارەدا کە زانیارییەکان تێدا بە زمانەکانی (کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی) بڵاوکراوەتەوە. لەلایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاوکراوەتەوە.

ئەم سەرچاوەیەی بەردەستتان کە بە ناونیشانی (بنەماکانی پێڕست و پۆلێن)ە، هەوڵمداوە تێیدا هەموو ئەو زانیاریانە بخەمەڕوو کە خوێنەدکاری بەشی زانیارییەکان و کتێبخانە، فەرمانبەرانی کتێبخانە پێویستیان پێیەتی، یاخود هەرکەس بیەوێت کە بنەماکانی زانیارییەکانی گەشە پێبدات لەبواری زانستی زانیارییەکان و کتێبخانە و چۆنییەتی بەکارهێنانی سیستەمەکانی پێڕست و پۆلێنی جیهانی، یاخود بۆ چۆنییەتی پێڕست و پۆلێنی کتێبخانە تایبەتیەکانی ماڵەوەمان. هەوڵمداوە کە بەزمانێکی سادەو ساکار بینووسم، کە زۆربەی خوێنەرەکان لە ئاستە جیاجیاکانی خوێندندا لێی تێبگەن و بەبێ مامۆستاش ئەو زانستە فێربن.

زانستەکانم بەشێوەیەکی وەها روونکردۆتەوە، بۆ زۆربەی بابەتەکان نموونەی پێویستم بۆ هێناوەتەوە. نموونەکان بە زمانەکانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی روونکردۆتەوە، واتە ئەم سەرچاوەیە هەردوو لایەنی (تیۆری و پراکتیکی) پێڕست و پۆلێن دەخاتە روو.

بۆ زیاتر ئاسانکردن بابەتەکانی ناو ئەم سەرچاوەیەم دابەشکردووە بۆ سێ بەشی سەرەکی کە ئەوانیش (پۆلێن – سەرەبابەت – پێڕست).

## <u>لە بواری پۆلێنکردندا ئەم بابەتانەم ئاماژە پێداوە:</u>

زانستی کتێبخانەکان، پێناسەیەك و کورتەیەکی مێژوویی، پۆلێن چییە؟ پێناسەیەکی پۆلێن.

مێژووی پۆلێنکردن، سیستەمەکانی پۆلێنکردن کۆن نوێ، میلڤل دیوی کێیە؟ کورتەیەك لەسەر ژیانی میلڤیل دیوی، پۆلێنی دیوی دەیی، خشتەی یەکەم و دووەم لە پۆلێنی دیوی دەیی، سیفەتەکانی هێما لە پۆلێنی دیویدا، ئەو هەنگاوانەی کە دەگیرێنەبەر بۆ دەست نیشانکردنی بابەتی سەرچاوەکە، پێدانی ژمارەی پۆلێن بە بابەتەکە، بنەماکانی پۆلێنکردن لە پۆلێنی دیوی دا، ئەرکەکانی هێما لە پۆلێنی دیوی

دا، ئەو پێداویستیانەی کە پێویستە لە بەشی پێڕست و پۆلێنکردندا هەبن، پۆلێنی فراوان و پۆلێنی تەسک، چەند تێبینییەکی گرنگ لەسەر یاساکانی پۆلێنکردن لە پۆلێنی دیوی دا.

خشتە یاریدەدەرەکان لە پۆلێنی دیوی دا و چۆنییەتی بەکارهێنانیان....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (١) دابەشکردنی پێوانەیی....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٢) دابەشکردنی ناوچەی جوگرافی....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٣)دابەشکردنی شێوازەکانی ئەدەب....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٤)دابەشکردنی شێوازەکانی زمان....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٥) کۆمەلگای مرۆڤایەتی بەپێی رەگەز، جۆر، نەتەوە....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٦)دابەشکردنی جۆری زمانەکان....

خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٧) دابەشکردنی کەسایەتییەکان بەپێی کارو پیشە....

## لە بواری سەرەبابەتدا ئەم بابەتانەم ئاماژە پێداوە:

پێناسەیەکی بابەت، سەرەبابەت پێناسەیەکی، سوودەکانی سەرەبابەت بۆ کتێبخانە، گرنگی سەرەبابەت بۆ کتێبخانەو جۆرە بەناوبانگەکانی سەرەبابەت، هەندێك هۆکارو بنەما لە هەڵبژاردنی سەرەبابەتدا، یاساکانی هەڵبژاردنی سەرەبابەت.

## لە بواری پێڕستکردندا ئەم بابەتانەم ئاماژە پێداوە:

پێناسەیەکی پێڕست و کورتەیەکی مێژووی، جۆرو شێوازەکانی پێڕست، بەراوردێك لە نێوان شێوازەکانی پێڕست و لایەنی باش و خراپی هەرجۆرێك، سوودەکانی پێڕست بە شێوەیەکی گشتی بۆ کتێبخانەو بنکە زانیارییەکان، ئەو زانیارییانەی بە هۆی پێڕستەوە لە کتێبخانەکاندا دەستمان دەکەوێت، جۆرەکانە پێڕست لەرووی

دەروازەکانییەوە، چۆنییەتی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر سەرچاوەیەك بەمەبەستی پێڕستکردن، کلێشەیەکی کارتی پێڕستکردن، هەندێك لەو نیشانانەی کە بەکاردێن لە کاری پێڕستکردندا، ئەو دووریانەی کە بەکاردێن لە کاری پێڕستکردندا، هەندێك نموونە لەسەرکاری پێڕستکردن بەزمانەکانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی، یاساکانی چۆنییەتی گۆڕینی ناوی نووسەر بە ژمارە (ژمارەی ناوی نووسەر)، چۆنییەتی گۆڕینی مێژووی زایینی بۆ کۆچی و کۆچی بۆ زایینی، چۆنییەتی پێڕستکردنی بڵاوکراوە حکومی و ڕێکخراوەییەکان، پێڕستکردنی ئەو سەرچاوانەی کە بەشێوەی زنجیرە دەردەچن (گۆڤارو ڕۆژنامەکان)، پێڕستکردنی دەستنووسەکان، پێڕستکردنی نەخشەو ئەتڵەس، پێڕستکردنی هۆکارەکانی بیستن و بینین.

خوێنەری خۆشەویست: بەو هیوایەم ئەم سەرچاوەیەی بەردەستتان ببێتە مایەیی ڕەزامەندیتان، هاوکارێکی باش بێت لەکاتی پێڕستکردن و پۆلێنکردندا، بەو هیوایەم کە وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانی ئێوە بداتەوەو کەلێنێکیش لە کتێبخانەی کوردی و بە تایبەتی بواری زانیارییەکان و کتێبخانە پڕبکاتەوە، هیوادارم ئێوەش بە سەرنج و ڕەخنەکانتان زیاتر بابەتەکانم دەوڵەمەندتر بکەن بۆ چاپی دووەم ئەگەر تەمەن ڕێگەیدا.

هەر سەرکەوتوو بن

شێرزاد

سلێمانی ١٨/١/٢٠١٠

## زانستی کتێبخانەکان، پێناسەیەکی و کورتەیەکی مێژوویی

زانستی کتێبخانەکان بریتییە لەو زانستەی کە گرنگی دەدات بە کتێبخانەکان، لە هەردوو ڕووی هونەری و کارگێڕییەوە، بە ئامانجی پاراستنی سەرچاوەکانی کلتووری مرۆڤایەتی و ڕێکخستنیان بەپێی یەکێك لە یاسا جیهانییەکان، کە بەهۆیەوە خوێنەر لە هەر شوێنێك و ئاستێکی خوێندندا بێت بتوانێت بگاتە ئەو سەرچاوانە.

مێژووی کتێبخانەکان دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠٠٠)ساڵ پێش زایین، ئەمەش لە ئەنجامی تاووتوێکردنی شوێنەوارە دێرینەکان، بەتایبەتی لە میزۆپۆتامیاو دۆڵی نیل).

## پۆلێن - التصنيف - classification

پۆلێن بریتییە لە جیاکردنەوەی سەرچاوەکانی کتێبخانە، بەپێی بابەتەکانی و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئەم بابەتانە بەپێی لێکچوون و لێك نزیکبوونیان لە بابەتەکاندا، بە مەرجێك لە بابەتی گشتییەوە بۆ بابەتی تایبەتتر لەهەمان پۆلدا، مەبەستیش لەم پۆلێنکردنە گەیشتنی خوێنەرانە بە ئاسانترین شێوەو کەمترین ماوە، بەو سەرچاوانەی کە لە کتێبخانەدا هەیە.

مرۆڤ هەر لە کۆنەوە گرنگی زۆریداوە بە پۆلێنکردن، بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە بەدەستمان گەیشتووە، مێژووی پۆلێنکردن دەگەڕێتەوە بۆ (٢٧٠٠) ساڵ پێش زایین کە لەسەر تاتە قووڕ ئەنجامیان دابوو، لە کتێبخانەی (نیبوور) لە میزۆپۆتامیا.

## سیستمەکانی پۆلێنکردن – کۆن و نوێ

١- پۆلێنی (میلڤل دیوی) لە ساڵی ١٨٧٦ لەلایەن میلڤل دیوی دۆزراوەتەوە، ژمارە بەکاردێنێت.

٢- پۆلێنی (دەیی جیهانی) لەلایەن (ئۆتیلا و هینری لاڤۆتین) دۆزراوەتەوە لە ساڵی ١٩٠٥ کە ژمارەو هەندێك نیشانەی تر بەکاردەهێنێت.

٣- پۆلێنی (کۆنگرێسی ئەمریکی) پیت بەکاردێنێت لە ساڵی ١٩٠٢ ئەم سیستمە بەکاردێت

٤- پۆلێنی (ڕانگاناسان = کۆلۆن) لەلایەن زانای ماتماتیکی هندی (ڕانگاناسان) دۆزراوەتەوە لە ساڵی ١٩٣٣ کە ژمارەو پیت (داش، شارحە) بەکاردەهێنێت.

٥- پۆلێنی بابەتی (جیمس براوون) لە ساڵی ١٩٠٦ تەنها پیت بەکاردەهێنێت.

٦- پۆلێنی (کەتەر = پۆلێنی فراوان) لە ساڵی ١٨٩١، دانانی هێما بۆ ناوی نووسەرە بیانییەکان.

٧- پۆلێنی نێودەوڵەتی (ڕایدەر).

## میلڤل دیوی کێیە؟

## کورتەیەك لەسەر ژیانی میلڤل دیوی

١- میلڤل لویس ك . دیوی، لە شاری (ئەدەمیز) لە نیویۆرك لە (١٠) دیسمبەری ساڵی ١٨٥١ لە دایك بووە.

٢- دوای ئەوەی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی تەواو دەکات لە زانکۆی (ئەلفرید) دواتر کۆلێجی (ئەمهرست) لە ساڵی ١٨٧٤بەشی ماتماتیك لەم کۆلیجە تەواو دەکات.

٣- له سالّی ١٨٧٣ پۆلێنه بهناوبانگهکهی دادهنێت.

٤- له سالّی ١٨٧٤ له کۆلێجی ئهمهرست وهك یاریدهدهری کتێبخانه دامهزراوه.

٥- له سالّی ١٨٧٦ بهشداریکردووه لـه دامهزرانـدنی کۆمهڵـهی کتێبخانـهکانی ئهمهریکا A.L.A

٦- لـه سـالّی ١٨٧٦ تـوانی گۆڤـاری (LIBRARY GORNAL) دهربکات و ببێت به سهرنووسهری گۆڤارهکه.

٧- له سالّی ١٨٧٦ چاپی یهکهمی پۆلێنه بهناوبانگهکهی بلاوکردهوه.

٨- له سالّی ١٨٧٦ بهشداریکردووه لـه دامهزرانـدنی کۆمهڵـهی کتێبخانـهکانی بهریتانیا.

٩- له سالّی ١٨٧٣ وهك ئهمینی کتێبخانهی کۆلۆمبیا دامهزراوه.

١٠- له سالّی ١٨٨٧ یهکهم قوتابخانهی فێربوونی زانستی کتێبخانهی دامهزراندووه.

١١- له سالّی ١٨٨٩ وهك بهڕێوهبهری کتێبخانهی نیویۆرك دامهزراوه.

١٢- له سالّی ١٨٩٥ یهکهم یانهی بهناوبانگی کتێبخانهی به نـاوی (لیـك بلاسـید) دامهزراندووه.

١٣- له سالّی ١٩٠٥ وهك بهڕێوهبهری گشتی کتێبخانهی نیویۆرك دامهزراوه.

١٤- له سالّی ١٩٠٦ پهیمانگای ئهمریکی بۆ زانستی کتێبخانه دامهزراندووه.

١٥- له ٢٦ دیسمبیری سالّی ١٩٣١ ئهو زانا بهناوبانگه کۆچی دوایی کردووه.

تاوهکو ئێستا ( ٢٢) چاپ له پۆلێنی دیوی دهرچووه، وهرگێردراوهته سهر زیـاتر لـه (١٢٨) زمان، زیاتر له (١٣٤) ولآت له جیهاندا ئهم سیستمه بهکاردههێنن، دوو چاپی ئهلیکترۆنیشی لێدهرچووه

(O.C.L.C.) لە ساڵی ١٩٩٦ – ١٩٩٩.
چ١ ساڵی ١٨٧٦ ٤٢ لاپەڕە.
چ٢ ساڵی ١٨٨٥ ٣١٤ لاپەڕە.
چ٣ ساڵی ١٨٨٨ ٤١٦ لاپەڕە.
چ٤ ساڵی ١٨٩١ ٤٦٦ لاپەڕە.
چ٥ ساڵی ١٨٩٤ ٤٦٧ لاپەڕە.
چ٦ ساڵی ١٨٩٩ ٥١١ لاپەڕە.
چ٧ ساڵی ١٩١١ ٨٩٢ لاپەڕە.
چ٨ ساڵی ١٩١٣ ٨٥٠ لاپەڕە.
چ٩ ساڵی ١٩١٥ ٨٥٦ لاپەڕە.
چ١٠ساڵی ١٩١٩ ٩٤٠ لاپەڕە.
چ١١ساڵی ١٩٢٢ ٩٨٨ لاپەڕە.
چ١٢ساڵی ١٩٢٧ ١٢٤٣ لاپەڕە.
چ١٣ساڵی ١٩٣٢ ١٦٤٧ لاپەڕە.
چ١٤ساڵی ١٩٢٤ ١٩٢٧ لاپەڕە.
چ١٥ساڵی ١٩٥١ ٧١٦ لاپەڕە.
چ١٥ ساڵی ١٩٥٢ ٩٢٧ لاپەڕە (چاپی دووبارە).
چ١٦ساڵی ١٩٥٨ ٢٤٣٩ لاپەڕە.
چ١٧ساڵی ١٩٦٥ ٢٤٨٠ لاپەڕە.
چ١٨ساڵی ١٩٧١ ٢٦٨٥ لاپەڕە.
چ١٩ساڵی ١٩٧٩ ٢٦٩٥ لاپەڕە.
چ٢٠ساڵی ١٩٨٩ ٣٢٨٢ لاپەڕە.
چ٢١ساڵی ١٩٩٦ ٤٠٣٧ لاپەڕە.
چ٢٢ساڵی ٢٠٠٣ ٣٩٨٢ لاپەڕە.

## (خشتەی یەکەم و دووەم لە پۆلێنی دیوی دەیی)

### خشتەی یەکەم

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٠٠٠ | زانستە گشتییەکان | المؤلفات العامة | generalities | سەوزی کاڵ |
| ١٠٠ | فەلسەفە | الفلسفة | philosophy | سەوزی تۆخ |
| ٢٠٠ | ئایینەکان | الديانات | religions | سپی |
| ٣٠٠ | زانستە کۆمەڵایەتییەکان | العلوم الاجتماعية | Social sciences | سور |
| ٤٠٠ | زمانەکان | اللغات | languages | زەرد |
| ٥٠٠ | زانستی سروشتی | العلوم الطبعية | Pure sciences | مۆر |
| ٦٠٠ | زانستی پراکتیك | العلوم التكنلوجية | Technology | رەش |
| ٧٠٠ | هونەرە جوانەکان | الفنون الجميلة | arts | قاوەیی |
| ٨٠٠ | ئەدەبیات | الاداب | Literature | رەساسی |
| ٩٠٠ | مێژوو جوگرافیاو یاداشت | تاريخ و الجغرافية والتراجم | History geography and biography | سەوزی زەرد باو |

## خشتەی دووەم

| | | | |
|---|---|---|---|
| generalities | المؤلفات العامة | زانستە گشتیەکان | ٠٠٠ |
| bibliography | الببليوغرافيا | بیبلۆگرافیا | ٠١٠ |
| Library and information sciences | علم المكتبات و المعلومات | زانستی کتێبخانە | ٠٢٠ |
| encyclopedias | الموسوعات و القواميس | ئینسایکلۆپیدیاو فەرهەنگ | ٠٣٠ |
| No used | غير مستخدم | بەکارنەهاتوە | ٠٤٠ |
| Periodical | الدوريات | گۆڤارو رۆژنامەو زنجیرەکان | ٠٥٠ |
| Organization | المنظمات | رێکخراوەکان | ٠٦٠ |
| Journalism | الصحافة | رۆژنامەگەری | ٠٧٠ |
| General collation | مجموعات العامة فی كتاب واحد | کۆمەڵێك بابەتی جۆراوجۆر | ٠٨٠ |
| manuscripts | المخطوطات والكتب النادرة | دەستنووس و سەرچاوە دەگمەنەکان | ٠٩٠ |
| philosophy | الفلسفة | فەلسەفە | ١٠٠ |
| metaphysics | الميتافيزيقا | میتافیزیقا، فەلسەفەی ئاوێتەبوون | ١١٠ |
| Knowledge | المعريفة | مەعریفە | ١٢٠ |
| Popular psychology | علم النفس الشعبي | دەروونناسی جادووگەری | ١٣٠ |
| Philosophical viewpoints | المذاهب الفلسفية | رێچکە فەلسەفییەکان | ١٤٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Psychology | علم النفس | دەروونناسی | ١٥٠ |
| logic | علم المنطق | زانستی مەنتیق | ١٦٠ |
| ethics | علم الاخلاق | زانستی خوڕەوشت | ١٧٠ |
| Ancient. Medieval.orietal philosophy | الفلسفة القديمة و الفلسفة الاسلامية | فەلسەفەی کۆن و فەلسەفەی ئیسلامی | ١٨٠ |
| Modern philosophy | الفلسفة الحديثة و الفلسفة الاوروبية | فەلسەفەی تازەو فەلسەفەی ئەوروپی | ١٩٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Religions | الديانات | ئاینەکان | ٢٠٠ |
| Islamic Religion | الدين الاسلامي | ئاینی ئیسلام | ٢١٠ |
| The holy Koran and its sciences | القران الكريم و علومه | قورئانی پیرۆزو زانستەکانی قورئان | ٢٢٠ |
| Speech of prophet Muhammad | الاحاديث النبوية و حياته | فەرموودەکانی پێغەمبەرو ژیانی | ٢٣٠ |
| Religion principles | اصول الدين | ئوسوڵی ئاین | ٢٤٠ |
| Jurisprudence | الفقه | فقه | ٢٥٠ |
| Sufism | التصوف | تەسەوف | ٢٦٠ |
| Christian Religion | الدين المسيحي | ئایینی مەسیحی | ٢٧٠ |
| Churches and Christian groups | الكنائس و الفرق المسيحية | کەنیسەو گروپە مەسیحییەکان | ٢٨٠ |
| Other religion | الديانات الاخرى | ئایینەکانی تر | ٢٩٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Social since | العلوم الاجتماعية | زانستی كۆمەلایەتی | ٣٠٠ |
| Statistics | الاحصاء | ئامار | ٣١٠ |
| Political since | العلوم السياسية | زانستی رامیاری | ٣٢٠ |
| Economics | الاقتصاد | ئابووری | ٣٣٠ |
| Law | القانون | یاسا | ٣٤٠ |
| Public administration | الادارة العامة | بەرێوەبردنی گشتی | ٣٥٠ |
| Social services | الخدمات الاجتماعية | خزمەتگوزاریـــــــە كۆمەلایەتییەكان | ٣٦٠ |
| Education | التربية و التعليم | پەروەردەو فێركردن | ٣٧٠ |
| Transpirations | التجارة | بازرگانی | ٣٨٠ |
| Folklore | العادات و التقاليد و الفولكلور | فۆلكلۆر | ٣٩٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Language | اللغات | زمانەكان | ٤٠٠ |
| Arabic language | اللغة العربية | زمانی عەرەبی | ٤١٠ |
| English language | اللغة الانكليزية | زمانی ئینگلیزی | ٤٢٠ |
| Germany language | اللغة الالمانية | زمانی ئەلمانی | ٤٣٠ |
| French language | اللغة الفرنسية | زمانی فەرەنسی | ٤٤٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Italian language | اللغة الايطالية | زمانی ئیتالی | ٤٥٠ |
| Spanish language | اللغة الاسبانية | زمانی ئیسپانی | ٤٦٠ |
| Latina language | اللغة الاتنية | زمانی لاتینی | ٤٧٠ |
| Greek language | اللغة اليونانية | زمانی یۆنانی | ٤٨٠ |
| Other language | اللغات الاخرى | زمانەکانی تر | ٤٩٠ |
| Kurdish language | اللغة الكردية | زمانی کوردی | ٤٩١.٥<br>٩٧ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Natural science | العلوم الطبعية | زانستە سروشتییەکان | ٥٠٠ |
| Mathematics | الرياضيات | بیرکاری | ٥١٠ |
| Astronomy | علم الفلك | زانستی گەردوون | ٥٢٠ |
| Physics | الفيزياء | فیزیا | ٥٣٠ |
| Chemistry | الكيمياء | کیمیا | ٥٤٠ |
| Geology | الجيولوجيا | جیۆلۆجیا | ٥٥٠ |
| Paleontology | علم المتحجرات | زانستی بەبەردبووەکان | ٥٦٠ |
| Anthropology | علم الاحياء | زیندەوەرزانی | ٥٧٠ |
| Botanical sciences | علم النبات | ڕووەك زانی | ٥٨٠ |
| Zoological sciences | علم الحيوان | زانستی ئاژەڵ | ٥٩٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Technology | العلوم التطبيقية | زانستی پراکتیك- تەکنەلۆجیا | ٦٠٠ |
| Medical sciences | العلوم الطبية | زانستی پزیشکی | ٦١٠ |
| Engineering | الهندسة | ئەندازیاری | ٦٢٠ |
| Agriculture | الزراعة | کشتوکاڵ | ٦٣٠ |
| Home economic | الاقتصاد المنزلي | ئابووری ناوماڵ | ٦٤٠ |
| Business services | الخدمات الادارية | بەڕێوەبردنی کارەکان | ٦٥٠ |
| Chemical technology | الصناعات الكمياوية | پیشەسازی کیمیاوی | ٦٦٠ |
| Manufactures | الصناعات | پیشەسازی | ٦٧٠ |
| Miscellaneous manufactures | الصناعات الدقيقة | پیشەسازی وورد | ٦٨٠ |
| Buildings | البناء | بیناسازی | ٦٩٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Arts | الفنون الجميلة | هونەرە جوانەکان | ٧٠٠ |
| Civic and landscapes arts | فن تجميل الاراضي و تخطيط المدن | هونەری نەخشەکێشان و جوانکردنی شار | ٧١٠ |
| Architecture | الهندسة المعمارية | ئەندازیای تەلارسازی | ٧٢٠ |
| Plastic arts | النحت و النقش | هەلکۆڵین و نەخشکردن | ٧٣٠ |
| Drawing | الرسم والفن الزخرفي | زەخرەفەو وێنەکێشان | ٧٤٠ |
| Panting | الرسم الزيتي | وێنەی زەیتی | ٧٥٠ |
| Prints | فن الطباعة | هونەری چاپکردن | ٧٦٠ |
| Photography | التصوير الشمسي | وێنەی فۆتۆگراف | ٧٧٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | الضوئي | | |
| Music | الموسيقى | مۆسیقا | ٧٨٠ |
| Performing arts | الرياضة و فن التمثيل | وەرزش و نواندن | ٧٩٠ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Literatures | الاداب | ئەدەبیات | ٨٠٠ |
| Arabic literatures | الادب العربي | ئەدەبی عەرەبی | ٨١٠ |
| English Literatures | الادب الانكليزي | ئەدەبی ئینگلیزی | ٨٢٠ |
| German Literatures | الادب الالماني | ئەدەبی ئەڵمانی | ٨٣٠ |
| French Literatures | الادب الفرنسي | ئەدەبی فەرەنسی | ٨٤٠ |
| Italian Literatures | الادب الايطالي | ئەدەبی ئیتاڵی | ٨٥٠ |
| Spanish Literatures | الادب الاسباني | ئەدەبی ئیسپانی | ٨٦٠ |
| Latin Literatures | الادب الاتيني | ئەدەبی لاتینی | ٨٧٠ |
| Greek Literatures | الادب اليوناني | ئەدەبی یۆنانی | ٨٨٠ |
| Other languages Literatures | الاداب الاخري | ئەدەبی گەلانی تر | ٨٩٠ |
| Kurdish Literatures | الادب الكردي | ئەدەبی کوردی | ٨٩١،٥٩٧ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| History geography and biography | تاريخ و الجغرافيا و التراجم | مێژوو جوگرافیا یاداشت | ٩٠٠ |
| Geography | الجغرافيا | جوگرافیا | ٩١٠ |
| Biography | التراجم | یاداشت | ٩٢٠ |
| Ancient history | تاريخ القديم | مێژووی کۆن | ٩٣٠ |
| Modern history and European | تاريخ الحديث و تاريخ الاوروبا | مێژووی نوێ و مێژووی ئەوروپا | ٩٤٠ |
| Asia history | تاريخ اسيا | مێژووی ئاسیا | ٩٥٠ |
| Africa history | تاريخ افريقا | مێژووی ئەفریقا | ٩٦٠ |
| North American history | تاريخ الامريكا الشمالية | مێژووی ئەمریکای باکوور | ٩٧٠ |
| South American history | تاريخ الامريكا الجنوبية | مێژووی ئەمریکای باشوور | ٩٨٠ |
| History of other part of world | تاريخ مناطق الاخرى في العالم | مێژووی ناوچەکانی تری جیهان | ٩٩٠ |
| Kurdistan history | تاريخ كوردستان | مێژووی کوردستان | ٩٥٦, ٦٧ |

## (سیفەتەکانی هێما لە پۆلێنی دیوی-دا)

١- نوسینی هێماکان ئاسانە.

٢- هێماکان کورتن.

٣- توانای فراوانبوونیان هەیە.

٤- دەتوانرێت هێمای تری لێ دروست بکرێت.

٥- هێمای بەکارهاتوو ژمارەی عەرەبییە.

## (ئەو هەنگاوانەی کە دەگیرێتە بەر بۆ دەست نیشانکردنی بابەتی سەرچاوەکەو پێدانی ژمارەی پۆلێن)

١- خوێندنەوەی ناونیشانی سەرچاوەکە، سەرەکی، بەرامبەر، یاریدەدەر.

٢- لیستی ناوەڕۆکی سەرچاوەکە.

٣- ناونیشانی بەشەکانی سەرچاوەکە.

٤- پێشەکی.

٥- کەشاف.

٦ - کورتکراوەکان.

٧ - خوێندنەوەی دەقی نووسینەکە.

٨ - وەرگرتنی بیروڕایی تایبەتمەندانی بوارە جیاجیا کان.

٩ - سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی دەرەکی وەك (بیبیلۆگرافیا، یاداشت، ئینسایکلۆپیدیا، مێژوو، ئەدەب، .....هتد).

## (بنەماكانی پۆلێنكردن لە پۆلێنی دیوی-دا)

١- پێویستە لەسەر پۆلێن كار كە خشتەی یەكەم و دووەمی پۆلێنی دیوی لەبەر بێت، شارەزایی هەبێت لە بەكارهێنانی خشتەكانی تردا.

٢- پێویستە لە خشتەكانی پۆلێنكردنەوە راستەوخۆ پۆلێن بكات، پەنا نەباتە بەر بەكارهێنانی (كشاف) تەنها بۆ دڵنیابوون نەبێت لە ژمارەی پۆلێنی هەڵبژێردراو لەلایەن پۆلێن كارەوە، بەڵام خشتە یاریدەدەرەكان (پۆلێن كار ) دەتوانێت لە هەركاتێكدا پێویست بكات بەكاری بهێنێت.

٣- پێویستە زانیاری تەواو هەبێت لەسەر ریزبەندی ژمارەكانی پۆلێن، ئەوە بزانرێت كە هەر ژمارەیەك لقێكە لە ژمارەكەی پێش خۆی، بۆ نموونە: ژمارە ١٣٢ ، ٦٢٩ لقێكە لە ژمارە

٦٢٩،١٣ لقێكە لە ژمارە

٦٢٩،١ لقێكە لە ژمارە

٦٢٩

٦٢٠

٦٠٠

٤- پێویستە گرنگی زۆر بدرێت بەو تێبینی و پێناسانەی كە لەلای ژمارەی پۆلێنەكانەوە نووسراوون، لە خشتەكانی پۆلێندا و بەهەند وەربگیرێت.

٥- پێویستە پشكنینی باش بكرێت بۆ سەرچاوەكان پێش ئەوەی كە ژمارەی پۆلێنی بدرێتێ.

٦- سوودی گشتی (مبدء المنفعة) دەبێت لەبەرچاو بگیرێت، پێویستە سەرچاوەكە ئەو ژمارە پۆلێنەی بدرێتێ كە زۆرترین خوێنەری كتێبخانەكە سوودی لێ دەبینن.

## (ئەرکەکانی هێما لە پۆلێنی دیوی-دا)

١- دەبێتە هاوکارێك بۆ ڕێکخستنی کتێبخانە.
٢- بەهۆیەوە دەتوانرێت سەرچاوەکانی کتێبخانە بخوازرێت و بگەڕێتەوە شوێنی خۆی بەبێ ئەوەی کار لە ڕێکخستنی کتێبخانەکان بکات.
٣- هۆکارێکە بۆ ڕێگا نیشاندانی خوێنەر بۆ ئەو سەرچاوانەی کە لە ناو کتێبخانەدا هەیە.
٤- دەبێتە هاوکارێك لە کاتی ئامارکردندا.

## (ئەو پێداویستیانەی کە پێویستە لە بەشی پێڕست و پۆلێنکردندا هەبن)
## ادوات العمل

١- سەرچاوەی جوگرافی و مێژووی، هەروەها نەخشە، بە زمانی کوردی عەرەبی ئینگلیزی.
٢- فەرهەنگ: بەزمانی کوردی عەرەبی ئیگلیزی، هەروەها زمانەکانی تریش.
٣- ڕۆژژمێر: کوردی، کۆچی، زایینی.
٤- سەرچاوە گرنگەکانی یاداشت: بە زمانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی.

## (پۆلێنی فراوان و پۆلێنی تەسك)

## پۆلێنی فراوان- التصنیف الواسع
## broad classification

لەجۆرە پۆلێنکردنەدا تەنها ژمارە سەرەکییەکان دەدەین بە بابەتەکان، واتە ناچینە ناو وردەکارییەکانەوە، ئەجۆرە پۆلێنکردنە بەکاردەهێنرێت لە کتێبخانە بچووکەکاندا.

## پۆلێنی تەسك = مەودا دوور = التصنیف الضیق
## clause classification

لەجۆرە پۆلێنەدا دەچینە ناو وردەکاری بابەتەکانەوەو دوورترین ژمارەی دەدەین بە بابەتی سەرچاوەکە، ئەمەش لە کتێبخانەی گشتی و تایبەتمەندەکاندا بەکاردێت.

بۆ نموونە/ (هندسة الحاسبات الالکترونیة) ژمارەی ٦٢١،٣٨١٩ دەدەینێ لە کتێبخانەی تایبەتدا، بەڵام هەرهەمان بابەت لە کتێبخانەیەکی بچووکدا ژمارەی ٦٢١ یاخود ٦٢١،٣ دەدەینێ.

## (چەند تێبینییەکی گرنگ لەسەر
## یاساکانی پۆلێنکردن لە پۆلێنی دیوی-دا)

١- سەرچاوەکە لەو شوێنەدا پۆلێن بکە، کە زۆرترین خوێنەر سوودی لێدەبینێت، بۆ نموونە سەرچاوەیەك بەناوی (الدکتاتوریون) ئایا لە سیاسەتدا دادەنرێت یاخود لە یاداشت.

٢- یەکەم هەنگاو سەرچاوەکە بە بابەتەکە پۆلێن بکە، دواتر بە شێواز (الشکل) بۆ نموونە:

گۆڤارێکی فیزیایی یەکەم هەنگاو بە فیزیا پۆلێن بکە دواتر بە گۆڤار واتە بەم شێوەیە:

٥٣٠،٥

٣-سەرچاوەکە لەو شوێنەدا پۆلێن بکە، کە راستەوخۆ بابەتەکە بگرێتەخۆ نەك بابەتی نزیك خۆی بۆ نموونە/ سەرچاوەیەك باس لە تۆپی پێ دەکات، لەگەڵ سەرچاوەکانی تری تۆپی پێ دەبێت نەك (یارییەکانی تۆپ)، یاخود یاری بەگشتی.

٤- ئەگەر سەرچاوەیەك هەبوو دوو بابەتی گرتبووەخۆ، ئەوا پۆلێنکار دەبێت لایەنێکیان هەڵبژێرێت، بۆ نموونە ئەو لایەنەی کە لە سەرچاوەکەدا بە زۆری باسی لێوەدەکات.

٥- ئەگەر سەرچاوەیەکمان لەبەر دەستدابوو باسی لە دوو بابەت دەکرد، بەڵام دوو بابەتەکە لەژێر یەك بابەتدا کۆ دەکرانەوە، ئەوا دەتوانین ژمارەی بابەتە کۆکراوەکەی بدەینێ .

بۆ نموونە/ سەرچاوەیەك باس لە (کیسەڵ و تیمساح)دەکات دەتوانین لەژێر ژمارەی ٥٩٨،١ پۆلێن بکەین کە بریتییە لە خشۆکەکان.

٦- ئەگەر بابەتێکمان هەبوو باسی لە کاریگەری ئەو بابەتە دەکرد لەسەر بابەتێکی تر، ئەوا بە ژمارەی ئەو بابەتە پۆلێنی دەکەین کە کاری تێکراوە، وەك (کاریگەری عەرەب لەسەر پێشکەوتنی شارستانی لە ئەوروپا)، بەم شێوەیە دەبێت: ٩٤٠ کە بریتییە لە مێژووی ئەوروپا.

٧- ئەگەر سەرچاوەیەکمان لەبەر دەستدابوو باسی لە سێ بابەت دەکرد، ئەوا لە ژێر ئەو بابەتەدا پۆلێنی دەکەین، کە هەرسێ بابەتەکە بگرێتەخۆ/ بۆ نموونە سەرچاوەیەك باس لە

(ئیسلام، هندۆس، جوولەکە)دەکات، ئەوا لەژێر ژمارە ٢٩٠ پۆلێن دەکرێت، کە بریتییە لە ئایینەکانی تر.

٨- ئەو سەرچاوە ئەدەبییانەی کە وەرگێڕدراون، ئەوا بە زمانە ئەسڵییەکەی خۆی پۆلێن دەکرێت.

٩ - ئەگەر سەرچاوەیەك باس لە ژیانی فەیلەسوفێك بکات، ئەوا لە یاداشتی فەیلەسوفدا پۆلێنی دەکەین، بەڵام ئەگەر باس لەبیروبۆچوونی فەیلەسووفەکان بکات ئەوا لە فەلسەفەدا پۆلێنی دەکەین. وەك ژیانی فەیلەسووفی ئەڵمانی (هیگڵ) ژمارەی ٩٢١،٩٣ دەدەینێ.

٩٢٠ یاداشت ١٩٣ فەلسەفەی ئەڵمانی نوێ ٩٢١،٩٣ فەیلەسوف هیگڵ.

١٠ - فەلسەفەی ئایینەکان واباشترە لەگەڵ ئایینەکان پۆلێن بکرێت، بەڵام فەلسەفەی ئاینێکی دیاریکراو واباشە کە لە فەلسەفەدا پۆلێن بکرێت.

بۆ نموونە: فەلسەفەی ئاینی ئیسلام لە ٢١٠ پۆلێن بکە.

ئاینی ئیسلام و فەلسەفەی شەرقی لە ١٨٠ پۆلێن بکە.

١١- فقە لە هەر مەزهەبێکدا لەناو ئەو جۆرە ئاینەدا پۆلێن بکە.

١٢- واباشترە کە ژیاننامەی پیاوانی ئاینی لەگەڵ ئاینەکەدا پۆلێن بکرێت.

١٣- دەرونزانی لە بابەتێکدا لە بابەتەکەدا پۆلێن بکە، بۆ نموونە (دەرونزانی پەروەردەیی) لە ٣٧١،١٥ پۆلێن بکە.

١٤ - ئاماری بابەتێك لەگەڵ بابەتەکەدا پۆلێن بکە، وەك ئاماری پەروەردەیی لە ٣٧٠،٢٦ پۆلێن بکە.

١٥- پلاندانانی هەر بابەتێك لەگەڵ بابەتەکەدا پۆلێن بکە.

١٦- یاسایی هەر بابەتێك لەگەڵ بابەتەکەدا پۆلێن بکە.

١٧- بابەتە گشتییەکان وەك (بیبیلۆگرافیا، فەرهەنگ، ئینسایکلۆپیدیا.....هتد) بەو زمانانەی کە بڵاوکراونەتەوە پۆلێن بکە.

١٨- بابەتە ئەدەبییەکان لەگەڵ ئەسڵی زمانی ئەو ئەدەبەدا پۆلێن بکە، دواتر شێوازی ئەدەبییەکەی بدەرێ، بۆ نموونە: شانۆی (یۆلیۆس قەیسەری شەکسپیر)لە ٨٢٢ پۆلێن بکە. چونکە شەکسپیر ئەدیبێکی ئینگلیزە و هێمای (٢) هێمایە بۆ شانۆ.

١٩- بابەتەکە یەکەمجار بە بابەتی سەرەکی پۆلێن بکە، دواتر بە شوێن، بۆ نموونە/ ئابوری بەریتانیا لە ٣٣٠،٩٤٢ پۆلێن بکە.

٢٠- ئەگەر سەرچاوەیەك بابەتە سەرەکییەکەی تایبەت بوو، بەڵام ئاماژەی بە شوێنێك دەدا وەك نموونە/ ئەوا ژمارە بابەتی سەرەکییەکەی دەدەینێ بەبێ ئەوەی ئاماژە بە شوێنەکە بدەین، بۆ نموونە: بیرۆکەی ئابووری لە هند لە ٣٣٠،١ پۆلێن بکە.

٢١- شەڕ لە ناوچەیەکی دیاریکراودا، لەو ناوچەیەدا پۆلێن بکە، شەڕ لە نێوان چەند وڵاتێکدا لە کیشوەردا پۆلێن بکە، شەڕی جیهانی لە مێژووی نوێدا پۆلێن بکە.

- رزگارکردنی شوێنێك لەو شوێنەدا پۆلێن بکە.

- شۆڕش لە وڵاتێکدا لە مێژووی ئەو وڵاتەدا پۆلێن بکە.

٢٢- شارستانی وڵاتێك لە مێژووی ئەو وڵاتەدا پۆلێن بکە، شارستانی و مەدەنییەت لە مێژووی گشتیدا پۆلێن بکە.

٢٣- ناوی کەسی، نازناو، ناوی خێزان، لە یادداشت پۆلێن بکە.

٢٤- ئەتڵەسی مێژوویی لە جوگرافیای مێژوویدا پۆلێن بکە.

٢٥- ئەتڵەسی جوگرافی لە جوگرافیادا پۆلێن بکە.

٢٦- دوورگەکان لەو شوێنەدا پۆلێن بکە کە لێوەی نزیکن.

٢٧- ناو ئەگەر بە چەند ولاتێکدا تێپەڕی، ئەوا لە کێشوەردا پۆلێنی بکە.

٢٨- ئیمپراتۆرییەتەکان لەو شوێنەدا پۆلێن بکە کە تێدا ژیاون، وەك ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی لە مێژووی بەریتانیادا پۆلێن بکە.

٢٩- لە گەشتە مێژووی و جوگرافییەکاندا، ئەگەر کەسەکە گرنگتر بوو لە شوێنەکە، ئەوا لە یادداشتدا پۆلێنی دەکەین.

٣٠- ئاژەڵ لە وێنەدا، لە وێنەدا پۆلێن دەکەین.

٣١- ئەگەر بلاوکراوەیەك بە ناوی (سەرکردەیەك، یاساناسێك، مێژوونوسێك) بلاوکرابووە، پێویستە بیرۆکەی سەرچاوەکە بزانین، ئەگەر تایبەت بوو بە مێژوو، ئەوا لە مێژوودا پۆلێنی دەکەین، ئەگەر تایبەت بوو بە ژیانی کەسایەتییەکە ئەوا لە (یادداشت) پۆلێنی دەکەین.

## (خشته یاریدەدەرەکان لە پۆلێنی
## دیوی-دا و چۆنێتی بەکارهێنانیان)

### خشتەی یاریدەدەری ژمارە (١) دابەشکردنی پێوانەیی
### التقسيمات القياسية - جدول المساعد رقم (١)
### Auxiliary table (1) = standard subdivision

هەموو کتێبخانەیەك جۆرەها سەرچاوەی رۆشنبیری جۆراوجۆری تێدایە، وەك کتێب، گۆڤار، فەرهەنگ، راپۆرت، لێکۆلێنەوە، دەستنووس......هتد، بەڵام بابەتەکانی ئەمجۆرە سەرچاوانە جۆراوجۆرن لە رووی شێوازی دەرەوەو ناوەوە.

- شێوازی دەرەوە مەبەستمان لەو شێوازەیە کە بابەتە زانستییەکەی پێ بڵاوبۆتەوە وەك/ ئینسایکلۆپیدیا، خوولاوەکان، فەرهەنگ، بیبیلۆگرافیا، دەلیل....هتد.

- شێوازی ناوەوە مەبەستمان لە شێوازی چارەسەرکردنی بابەتەکەیە لە رووی ناوەرۆکەوە، وەك چارەسەرکردنی بابەتێك لە رووی مێژوویی، یاخود لە رووی شوێنەوە، یاخود لە رووی زمانەوە، یاخود لە رووی ئەدەب.....هتد.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم بابەتانە(دیوی) حەوت خشتەی یاریدەدەری داناوە.

## ناوەرۆکی خشتەی یاریدەدەری ژمارە (١)

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٠١ | فەلسەفەو تیۆر | الفلسفة و النظرية | Philosophy and theory |
| ٠١٦ | بیبیلۆگرافیاو پێرست | البيبلوغرافيا و الفهارس | Bibliography and catalog |
| ٠٢ | بابەتی جۆراو جۆر | المتفرقات ( الملخصات الكتب اليدوية، براعة الاختراع، المواد السمعية و البصرية). | Miscellany |
| ٠٢١ | خشتەی ئامار | جداول الاحصائية، مرافعات، اختراعات | Tabulated materials |
| ٠٢٢ | هۆکاری فێرکردن | وسائل التوضيحية و النماذج، مخططات صور التوضيحية. | Illustration and models |
| ٠٢٥ | رێبەر | الدليل | Directories |
| ٠٣ | فەرهەنگ و ئینسایکلۆپیدیا | القواميس و الموسوعات. | Dictionary and encyclopedias |
| ٠٤ | بابەتی گشتی * | عام خاص | Special general |
| ٠٥ | بابەتە خولاوەکان | الدوريات | Serial publication = periodical |
| ٠٦ | رێکخراوەکان | المنظمات | Organization |
| ٠٧ | پەروەردەو فێرکردن | التربية و التعليم | Study and teaching |
| ٠٧٤ | مۆزەخانەو پێشانگا | المتاحف و المعارض | Museums and exhibits |

- المعالجة التاريخية و الجغرافية لعلم الجريمة ٣٦٤،٩
- الجرائم في لندن ٣٦٤،٩٤٢١

بۆ نموونە/ التعليم النسوي ٣٧٦

المعالجة التاريخية و الجغرافية ٩،٣٧٦

تعليم البنات في دول الافرو الاسيوية ٣٧٦،٩١٧٦٥

بۆ نموونە/ جۆرەکانی خاك و خۆڵ ٦٣١،٤٧

جۆرەکانی خاك و خۆڵ لە ناوچە مەدارییەکان ٦٣١،٤٧١٣

بۆ نموونە/ جوگرافیای مێژوویی ٩١١

جوگرافیای مێژوویی لە ئاسیا ٩١١،٥

تێبینی/ هەندێك بابەت هەیە لەکاتی بەکارهێنانی خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٢)دا ئەو یاسایەی پێشووی بەسەردا جێبەجێ نابێت، لەوانە

بۆ نموونە/ مێژووی کەنیسەی مەسیحی ٢٧٠

ئامار ٣١٠

جیولۆجیا ٥٥٠

جوگرافیا ٩١٠

لەم کاتەدا (٠)ی ژمارە سەرەکییەکە لادەبەین دواتر ژمارەی ناوچە جوگرافیەکەی بۆ زیاد دەکەین بەم شێوەیەی خوارەوە/

٣١٠ ئامار ٣١٤ ئامار لە ئەورووپا

٣١٥ ئامار لە ئاسیا

٣١٤،٢ ئامار لە ئینگلترا

٣١٥،٣٨ ئامار لە سعودیە

٥٥٨،٢ جیۆلۆجیای ئەرجەنتین

٢٧٤،٨٥ کەنیسەی مەسیحی لە سوید.

## یاساکانی بەکارهێنانی خشتەی یاریدەدەری ژمارە (١)

لەبەرئەوەی کە ژمارەکانی ئەم خشتەیە لە پێشەوەی هێمای (-) هەیە، مانای وایە ئەم ژمارانەی بە تەنها بەکارنایەن، بەڵکو زیاد دەکرێت، یاخود دەخرێتە پاڵ ژمارە سەرەکییەکان.

دەتوانرێت ئەم ژمارانە بلکێنرێت بە هەر ژمارەیەکی سەرەکییەوە، بەڵام بەپێی ئەم یاساو رێنمایانەی خوارەوە.

١- ئەگەر ژمارە سەرەکییەکە بە سفر کۆتایی نەهاتبوو (کە ژمارەیەکی زۆری پۆلێنی دیوی لەم جۆرە ژمارانەن)، ئەوا راستەوخۆ ژمارە یاریدەدەرەکە بۆ ژمارە بنچینەیەکە زیاد دەکرێت.

- بۆ نموونە/ زانستی بێستان ٦٣٥
- گۆڤارێك لە زانستی بێستان ٦٣٥،٠٥
- دڵنیایی کۆمەڵایەتی ٣٦٨،٤
- فەرهەنگی دڵنیایی کۆمەڵایەتی ٣٦٨،٤٠٣
- خشڵ و گەوهەر ٧٣٩،٢٧
- چەند نموونەیەك لە خشڵ و گەوهەر ٧٣٩,٢٧٠٢٢

٢- ئەگەر ژمارە بنچینەیەکە بە سفر کۆتایی هاتبوو (کە لە پۆلێنی دیوی دا ئەوەت ژمارەی وەها هەیە). ئەوا سفری ژمارە یاریدەدەرەکە لادەبەین و دەیلکێنین بە ژمارە سەرەکییەکەوە. بۆ نموونە/

- پەروەردە و فێرکردن ٣٧٠
- فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن ٣٧٠،١

ژمارە سەرەکییەکە لادەبەین و دواتر شێوازی ئەدەبییەکەی بۆ زیاد دەکەین.

بۆ نموونە/ هۆنراوەیەکی ئینگلیزی

ئەدەب ٨٠٠

ئەدەبی ئینگلیزی ٨٢٠

هۆنراوەی ئینگلیزی ٨٢١

- گۆڤارێك لە هۆنراوەی ئینگلیزیدا ٨٢١،٠٥

- کۆمەڵێك بابەت لە هۆنراوەی ئینگلیزیدا ٨٢١،٠٨

٨٠٠ ئەدەب ٨٠٠ ئەدەب

٨٤٠ ئەدەبی فەرەنسی ٨٤٠ ئەدەبی فەرەنسی

٨٤٣ چیرۆکی فەرەنسی ٨٤٢ شانۆی فەرەنسی

ئەگەر ژمارەی سەرەکی ئەدەبەکە بە (٠)کۆتایی نەهاتبوو ئەوا راستەوخۆ ژمارەی شێوازی ئەدەبەکەی بۆ زیاد دەکەین، بۆ نموونە/

٨٠٠ ئەدەب

٨٩٠ ئەدەبی گەلان

٨٩١،٥ ئەدەبی گەلانی هند و ئەورووپی

٨٩١،٥٩٧ ئەدەبی کوردی

٨٩١،٥٩٧٣ چیرۆکی کوردی.

٧- بەشێوەیەکی گشتی تەنها یەك (٠) زیاد دەکرێت بۆ ژمارە سەرەکییەکە، بەڵام ئەگەر ژمارەی درووستبوو مانایەکی تری بەخشی، ئەوا دەکرێت دوو(٠) یاخود زیاتر زیاد بکرێت.

بۆ نموونە/ فەلسەفەی زانستی رامیاری ژمارەکەی ٣٢٠،١، بەڵام ئەم ژمارەیە لە لیستی سەرەکی پۆلێندا مانایەکی تری هەیە، بۆیە وا پێویست دەکات کە سفرێکی تر بۆ نێوان ژمارە یاریدەدەرەکەو ژمارە سەرەکییەکە زیاد بکرێت، بەم شێوەیە/ ٣٢٠،٠١ فەلسەفەی سیاسی.

## (چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەم خشتەیە)

ئەم ژمارانە تەنها لەگەڵ بابەتە زمانەوانییەکاندا بەکاردێن، ئەویش بە زیادکردنی ژمارەی شێوازی زمان بۆ ژمارەی بنچینەیی (زمانەکە). دوای لابردنی (٠)ی ژمارە بنچینەیەکە ئەگەر هەبوو، وە ئەگەر (٠)ی نەبوو ئەوا راستەوخۆ ژمارەکە زیاد دەکەین، دواتر دوای سێ ژمارە (،) دادەنێین.

بۆ نموونە/ النحو العربي ٤١٥ اللهجات الايطالية ٤٥٧

* النطق الانكليزي ٤٢١،٥٢ اللغة البرتغالي ٤٦٩

* النحو البرتغالي ٤٦٩،٥ اللغة اليونانية الحديثة ٤٨٩،٧

* اللغة الكردية ٤٩١،٥٩٧٥

* النحو والصرف في اللغة ٤٠٥ الاشتقاق في اللغة ٤٠٢

* الكتابة و الاصوات في اللغة العربية ٤١١

- رەوانبێژی لە زمانی کوردیدا ٤٩١،٥٩٧٤

- کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا ٤٩١،٥٩٧٦

- مێژووی رێزمانی ئینگلیزی ٤٢٥،٠٩

- رێزمانی سویدی ٤٣٩،٧٥

## (چۆنییەتی پۆلێنکردنی فەرهەنگ)

ا- فەرهەنگی یەك زمان، واتە وشەکانی تایبەت بێت بە زمانێکی دیاریکراو

فەرهەنگی کوردی - کوردی ٤٩١،٥٩٧٣

فەرهەنگی عەرەبی - عەرەبی ٤١٣

فەرهەنگی یابانی - یابانی ٤٩٥،٦٣

فەرهەنگی روسی - روسی ٤٩١،٧١٣

* سەرەتا هێمای زمانەکە دادەنێین، دواتر هێمای فەرهەنگی بۆ زیاد دەکەین.

## خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٢) بریتییە لەم ژمارانە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | شوێن، ناوچە، ناوچەی جوگرافی بە شێوەیەکی گشتی وەك ناوچەی هێڵی ئیستیوا، شاخ، دەشت، دانیشتوان. | مساحات ، مناطق ، الاماكن الجغرافية بصورة عامة مثل المناطق المتجمدة و الحرارية و الاستوائية و الجبلية و السهول و الفضاء و كثافة السكان و ...الخ | AREEAS REGIONS PLACES IN GENERAL<br><br>PERSION REGARDLESS OF AREA REGION PLACE |
| ٢ | کەسایەتی بەبێ گرنگیدان بە شوێن | الاشخاص دون الاهتمام بالمكان . | THE ANCIENT WORLD |
| ٣ | جیهانی کۆن. | العالم القديم . | The ancient world |
| ٣١ | چین. | الصين. | China |
| ٣٢ | میسر. | المصر. | Egypt |
| ٣٣ | فەلەستین. | الفلسطين. | Palestine |
| ٣٤ | هند. | الهند. | India |
| ٣٥ | دۆڵی رافدین و ئێران. | وادي الرافدين و ايران. | Mesopotamia |
| ٣٦ | ئەوروپای کۆن. | اوروبا القديم. | Europe north and west of Italian peninsula |
| ٣٧ | نیمچە دورگەی ئیتالیا. | شبه جزيرة الايطالية. | Italian peninsula |
| ٣٨ | یۆنان. | اليونان. | Greece |

**خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٥)**

**کۆمەڵەی مرۆڤایەتی، بەپێی رەگەزو جۆرو نەتەوە**

**جدول مساعد رقم (٥) الجماعات السلالية و العرقية و القومية**

Table (5) ethnic and national groups

**ناوەڕۆکی خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٥)**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | گەلانی ئەمریکای باکورر | الامريكيون الشماليون. | North American. |
| ٢ | بەریتانییەکان، ئینگلیزەکان، ئەنگلۆساکسۆنییەکان | البريطانيون، الانكليز، الانجلوساكسون. | British. English. Anglo Saxons. |
| ٣ | نۆردییەکان. | النورديون (الجرمانيون). | Germanic people. |
| ٤ | لاتینیەکان. | اللاتينيون الحاليون. | Modern Latin people. |
| ٥ | ئیتاڵییەکان، رۆمانەکان. | الايطاليون، الرومانيون. | Italians. Romanians. |
| ٦ | ئیسپانەکان و پرتوگالەکان. | الاسبانيون و البرتوغاليون. | Spanish and Portuguese. |
| ٧ | گەلانی ئیتاڵی تر (رۆمانییە کۆنەکان). | شعوب الايطالية الاخرى. | Other italic peoples. |

لە خوارەوەی ئەم ژمارەیە هیچ تێبینیەك نییە، بە بەكارهێنانی خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٢) بۆیە ژمارەی (٠٩) بۆ محاصیل زیاد دەكەین، دواتر هێمای (ئەسیوبیا) بۆ ئەم ژمارە سەرەكییە زیاد دەكرێت ٦٣٣،٠٩٦٣

نموونەیەكی تر/ الموسیقی في الاسبانیا

الموسیقی ٧٨٠

٧٨٠،٩ المعالجة الجغرافیة

٧٨٠،٩٤٦ الموسیقی في الاسبانیا

* نموونەیەكی تر/ الخدمات الاجتماعیة في لاهور

٣٦٠ الخدمات الاجتماعیة

٣٦٠،٩ معالجة الجغرافیة

٣٦٠،٩٥٤ الخدمات الاجتماعیة في الهند

٣٦٠،٩٥٤٩١٤٣ الخدمات الاجتماعیة في لاهور

نموونەیەكی تر/ البنوك في مدینة لوس الانجلس

البنوك ٣٣٢،١

البنوك في الولایات المتحدة ٣٣٢،١٠٩٧٣

البنوك في مدینة لوس الانجلس ٣٣٢،١٠٩٧٣٤٩٤

٢- ئەگەر لەگەڵ بابەتە سەرەكییەكەدا تێبینی هەبوو بە بەكارهێنانی خشتەی یاریدەدەری ژمارە (٢) ئەوا راستەوخۆ هێمای تایبەتی خشتەی ژمارە (٢) زیاد دەكەین بۆ ژمارە سەرەكییەكە.

بۆ نموونە/ كرێ لە یابان

كرێ ٣٣٢،١

كرێ لە یابان ٣٣٢،١٢٩٥٢

- بۆ نموونە/ الجریمة و علم الاجرام ٣٦٤

| | | | |
|---|---|---|---|
| Reviews and exercises | كتـــب التمـــارين و المراجعة | سەرچاوەی راهێنان** | ٠٧٥ |
| Collection | المجموعات | کۆمـەڵێك بابـەت لەیـەك سەرچاوەدا | ٠٨ |
| Geographical treatment | المعالجـة التاريخيـة و الجغرافية. | چارسـەرکردنی بابەت لـە رووی مێژوو جوگرافیاوە | ٠٩ |
| Treatment by areas | المعالجة الجغرافية | چارســـەرکردنی بابـــەت لەڕووی شوێنەوە | ٠٩١ |
| Person regardless | التراجم. | یادداشت | ٠٩٢ |
| Treatment by specific continents country and location | معالجــــة جغرافيــــة حســــب القــــارات و الاقطار. | چارسەرکردنی بابەت لـە رووی جوگرافیـــــــــای کیشــــــوەرەکان، وڵات، ناوچـــــە جیاجیاکـــــانی جیهان. | ٠٩٣ |

* ئەمەش هەندێك بابـەت دەگرێتـەخۆ، ئـەم ژمارەیـە بەکارنایـەت، ئەگـەر زانیـاری لەلای بابەتە سەرەکییەکەوە نەبێت کە ئاماژە بە بەکارهێنانی ئەم ژمارەیە بکات.

** ئەمــەش ئــەو سەرچـاوانە دەگرێتـەخۆ، کـە تایبـەتن بـە وەڵامدانـەوەی پرسـیار راهێنان.

425.7
G	Graver, B.D.
Advanced English practiced / by B.D.grver.-
3rd.ed.-
New York: oxford university press, 1988.
320p.24*12c.m.-
Appendix-exercises p.275-320
1-english language – grammar
I-title

427
S	sidle, Jennifer
English idioms/by Jennifer sidle, W. Mcmored.-
5th.ed.-
New York: Oxford University, 1988.
267p.14*16c.m
Index p.243-267
Isbn0-19-43277-2
1-english language-idioms
I-mc moored (Authorship)
Ii-title

## یاساکانی چۆنییەتی گۆڕینی ناوی نووسەر بە ژمارە (ژمارەی ناوی نووسەر)

## Author number- رقم الطلب

بە مەبەستی زیاتر خزمەتی خوێنەران و ئاسان گەیشتنی سەرچاوەکانی کتێبخانە بە دەستی خوێنەرانە لە کەمترین ماوەدا، بە مەبەستی زیاتر ئاسانکردنی کاری پۆلێنی سەرچاوەکانی کتێبخانە، بە تایبەتی کاتێك سەرچاوەکان لە بابەتەکانیاندا چوون یەك بن، وا باشترە کە ژمارەیەکیش بۆ ناوی نووسەرەکان دابنرێت بە مەبەستی زیاتر ووردبوونەوە لە ناو کاری پۆلێنکردندا. بۆ ئەم مەبەستەش شارەزایان لە بواری زانستی پێرست و پۆلێنکردندا، لیستی (کەتر)یان ئامادەکردووە بۆ گۆڕینی نازناوی نووسەری بیانی بۆ ژمارە، هەروەها ئەم خشتەیەی کە لە خوارەوە ئاماژەی پێدراوە ئامادەکراوە بۆ گۆڕینی نازناوی ناوی نووسەری عەرەبی و کوردی.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢ | ب | ر | ع | ا |
| ٣ | ت | ز | غ | و |
| ٤ | پ | س | ف | ی |
| ٥ | ج | ش | ق | م |
| ٦ | ح | ص | ك | پ |
| ٧ | خ | چ | ل | ڤ |
| ٨ | د | ط | ن | گ |
| ٩ | ذ | ظ | ه | چ |

بەپێی ئەم خشتەیە، ئەگەر نووسەرێك بە نازناوێکی دیاریکراو بەناوبانگبوو، ئەوا پیتی یەکەمی نازناوەکەی وەك خۆی دەنووسینەوە، دواتر سێ پیتی نازناوەکەی یاخود ناوەکەی دەگۆڕین بە ژمارە بە پێی خشتەکەی سەرەوە، بە مەرجێك ئەگەر ناوەکە یاخود نازناوەکە لە ناوی (عەرەبی)دا ئەگەر بە (ال) دەستپێکرد ئەوا (ال)ەکە وەك خۆی دەهێڵینەوە و نایگۆڕین بە ژمارە، بەڵکو سێ پیتی دوای ئەو دەگۆڕێن بە ژمارە بۆ نموونە/

نووسەرێك نازناوەکەی (ابو حمزه)یە (ا)ی (ابو)وەك خۆی دەنووسینەوەو دواتر سێ پیتی وشەی (حمزه)دەگۆڕین بە ژمارە بەم شێوەیە ا ٦٥٣

- الجاحظ دەبێت بە ج ٢٦٨

- هەندێك نووسەر بە ناوی شارەکانیانەوە بەناوبانگن، یاخود بە ناوی وڵاتەکانیانەوە، ئەوا لەوکاتەدا دەروازەی سەرەکی بەناوی شارەکە یاخود وڵاتەکەوە دەبێت، بۆ نموونە/

النجفی، العراقی، بانەیی، الرصافی، الخزرجی، کۆیی.

* النجفی= ن ٥٤٤ * العراقی= ع ٢٢٥

* ئەگەر نووسەری سەرچاوەیەك ناوی (عباس محمود العقاد)بێت ئەوا ژمارەی تایبەتی ناوی نووسەرەکە بەم شێوازە دەبێت، نازناوی نووسەرەکە کە (العقاد)ە، دێتە پێشەوە و ژمارەی ناوی نووسەرەکە بەجۆرە دەبێت: ع ٥٢٨

* ئەگەر ناوی نووسەرێك (اسماعیل بن محمد ابو الفضل)بێت، ئەوا ژمارەی تایبەتی ناوی نووسەرەکە بەم شێوەیە دەبێت: ابو الفضل ا ٤٧٧، سەرنج بدە (ا)ی (ابو) وەرگیراو، دواتر چوینە سەر ناوی(الفضل) (ال)ی ناوەکەمان پەڕاندوو چوینە سەر پیتەکانی ناوی (الفضل) بەپێی خشتەکە گۆڕیمان بۆ ژمارە.

* شێرکۆ بێکەس: ئەگەر بمانەوێت ژمارەی تایبەتی ناوی ئەم نووسەرە دەربهێنین، ئەوا وشەی (بێکەس) کە نازناوی نووسەرەکەید دەهێنینە پێشەوەو پیتی (ب) دادەنێین و دواتر سێ پیتی دوای نازناوەکە دەگۆڕین بە ژمارە بەم شێوەیە ب ٤٦٤ .

* ئەگەر دەزگایەکی وەك زانکۆ هەڵسا بە بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەیەك، ئەوا هەمان مامەڵەی ناوی نووسەری لەگەڵ دەکەین بۆ نموونە (جامعە بغداد) پیتی (ج)ی وشەی (جامعە)وەردەگرین و دواتر دەچینە سەر وشەی (بغداد)و سێ پیتی دەگۆڕین بە ژمارە بەم شێوەیە:

ج ٢٣٨

* هەروەها ئەگەر نووسەری سەرچاوەیەك ناوی (احمد بن محمد الحنبلي)بێت ئەوا ژمارەی ناوی نووسەرەکە بەم شێوەیە دەبێت: ح ٨٢٧

## چۆنییەتی گۆڕینی مێژووی کۆچی، بۆ زایینی و زایینی بۆ کۆچی

### گۆڕینی مێژووی کۆچی بۆ مێژووی زایینی

بۆ گۆڕینی مێژووی کۆچی بۆ زایینی ئەم یاسایە پەیڕەو دەکەین:

رۆژمێری زایینی= رۆژمێری کۆچی + ٦٢٢ - رۆژمێری کۆچی / ٣٣

نموونە/ سالی (١٣٠٠)ی کۆچی بگۆڕە بۆ زایینی

رۆژمێری زایینی = ١٣٠٠+٦٢٢- ١٣٠٠ / ٣٣

= ١٩٢٢-٣٩

= ١٨٨٣

نموونە/ سالی (١٤٢٥)ی کۆچی بگۆڕە بۆ زایینی

رۆژمێری زایینی= ١٣٠٠+٦٢٢ — ١٤٢٥ / ٣٣

= ٢٠٤٧-٤٣

= ٢٠٠٤

## گۆڕینی مێژووی زایینی بۆ کۆچی

بۆ گۆڕینی مێژووی زایینی بۆ کۆچی پەیڕەوی ئەم یاسایە دەکەین:

**مێژووی کۆچی= مێژووی زایینی – ٦٢٢ + مێژووی زایینی - ٦٢٢**

**٣٣**

نموونە/ ساڵی (١٨٨٣)ی زایینی بگۆڕە بۆ کۆچی

ڕۆژمێری کۆچی= ١٨٨٣- ٦٢٢ + ١٨٨٣ – ٦٢٢

٣٣

= ١٢٦١ + ٣٩

= ١٣٠٠ ك

نموونە/ ساڵی (١٩٧٥)ی زایینی بگۆڕە بۆ کۆچی

ڕۆژمێری کۆچی= ١٩٧٥ – ٦٢٢ + ١٩٧٥ – ٦٢٢

٣٣

= ١٣٥٥ + ٤١

= ١٣٩٤ کۆچی

## چۆنێتی پێڕستکردنی بڵاوکراوەی حکومی و ڕێکخراوەییەکان

### بڵاوکراوەی حکومی- المطبوعات الحكومية =
### Government publication

ئەو بڵاوکراوە ڕۆشنبیریانە دەگرێتەوە، کە لەلایەن ڕێکخراوە حکومییەکانەوە دەردەچێت و بڵاودەکرێتەوە وەك/ سیستمی ڕێکخستن، بڕیار، زانیاری، بەڕێوەبردن، ئامار،...هتد .

* بڵاوکراوە حکومییەکان لەژێر ناوی وڵات، یاخود هەرێم یاخود پارێزگا، یاخود هەریەکەیەکی ئیداری و سیاسی پێڕست دەکرێت.

### چەند تێبینییەك لەسەر پێڕستکردنی بڵاوکراوە حکومییەکان:-

١- باشتر وایە دەروازەی پێڕستکردنەکە بە کورتکراوەیی ناوی وڵاتەکە بێت بۆ نموونە/

کۆماری عیراقی فیدراڵ دەبێت بە عیراق

United States of American

دەبێت بە

U s a

بەم شێوەیەش ئەگەر وەزارەتی خوێندنی باڵای عێراقی بڵاوکراوەیەك بڵاوکاتەوە، دەبێت دەروازەی پێڕستکردنەکەی بەجۆرە بێت/

عێراق. وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی.

عێراق . هەرێمی کوردستان . وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی.

٢- ئەگەر ناوی دوو ناوچە، شوێن، وڵات، لێکچوون. ئەوا پێویستە بە سیفەتێك ناوی یەکێکیان لەویتریان جیابکەینەوە، وا باشترە ناوی ئەو شوێنە پێناسە بکەین کە

کەمتر ناسراوە و بڵاوە، ئەویش بە نووسینی سیفەتەکەی شوێنە نەناسراوەکە کە لە تەنیشت ناوەکەوە لە نێوان دوو کەوانەدا دەنووسرێت. بۆ نموونە/ **الجزائر (المدينة)**
**الجزائر(العاصمة)**

Berlin (east)
Berlin (west)

٣- ئەو بڵاوکراوانەی کە لەلایەن وەزارەتەکانەوە دەردەچێت راستەوخۆ لەژێر ناوی وڵاتەکەدا دەبێت دواتر ناوی وەزارەتەکە. بۆ نموونە/ العراق. وزاره التربيه و التعليم

٤- ئەو بڵاوکراوانەی کە لەلایەن بەڕێوبەرایەتییەکەوە دەردەچێت سەر بە وەزارەتێکە، ئەوا دەروازەی پێڕستکردنەکە بە ناوی وڵات، دواتر وەزارەت، دواتر ناوی بەڕێوەبەراتیەکەوە دەنووسرێت

بۆ نموونە/ عێراق . هەرێمی کوردستان ، وەزارەتی رۆشنبیری . بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان.

٥- ئەو بڵاوکراوانەی کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیەکەوە دەردەچێت، تەنها ئەو بەڕێوبەرایەتیە لە وڵاتەدا هەبێت، ئەوا دەروازەی پێڕستکردنەکە بە ناوی وڵاتەکە دواتر بە ناوی بەڕێوەبەرایەتیەکە دەبێت، بۆ نموونە/ عێراق. بەڕێوەبەرایەتی کەلەپووری گشتی
عێراق . ئەنجوومەنی خزمەتی گشتی

تێبینی/ ئەگەر ناوی وەزارەتێك لە وڵاتیکدا گۆڕدرا بە ناوێکی تر، پێویستە لەسەر کارمەندانی بەشی پێڕست کە کارتی رێگە نیشاندان بەکاربهێنن لە ناوە کۆنەکەوە بۆ ناوە تازەکە بۆ نموونە/

**العراق . وزارة الاصلاح الزراعی**

**انظر**

**العراق . وزارة الزراعة و الاصلاح الزراعی**

٦- ئەگەر فەرمانبەرێك سەر بە بەرێوبەرایەتییەكی دیاریكراو هەڵسـا بـە دەركردنـی بڵاوكراوەیەك، ئەوا ئەو بڵاوكراوەیە بە ناوی بەرێوەبەرایەتیەكـەوە بڵاودەكرێتـەوە نـەك بـە ناوی فەرمانبەرەكەوە، بەڵام دەتوانین ناوی فەرمانبەرەكە لە كارتی پێرستدا بنووسین.

بۆنموونە : جامعةبغداد.مركز البحوث التربوية و النفسية
كتب القراءة فى المرحلة الابتدائية/ تحليل ونقد
موفق الحمداني، يعقوب الخميسي.-

## بڵاوكراوەی رێكخراوە حكومییەكان

ئـەو بڵاوكراوانـەی كـە لەلایـەن رێكخـراوە حكومییـەكان دەردەچـن و راسـتەوخۆ حكومەت سەرپەرشتیان دەكات، لەژێر ناوی رێكخراوەكـە راسـتەوخۆ پێرسـت دەكرێـت، بەبێ ئەوەی كە ناوەكە بگەرێتەوە بۆ ئەو بەرێوەبەرایەتیە، یاخود ئـەو وەزارەتـەی كـە ئـەم رێكخراوە سەر بەو بێت، ئەویش لەم كاتانەدا:-

١- رێكخراوی رۆشنبیری و بازرگانی و زانستی وەك/
مجلس البحث العلمى ، المجمع العلمى العراقى
British council - academia (n a u k) (s s s r)
٢-پەیمانگاكان Institutions
وەك/ پەیمانگا و زانكۆكان و كۆلیجەكان مۆزەخانە و كتێبخانە.
زانكۆی سلێمانی. كتێبخانەی گشتی.
پەیمانگای تەكنیكی سلێمانی بەشی كتێبخانە و زانیارییەكان
٣-بنكە فەلەكییەكان
وەك: مرصد حلوان/ مرصد البصرة
٤-ئەو رێكخراوانەی كە بەپێی رێكەوتنی حكومی دامەزراون

وەك/ المركز القومي للآستشارات و التطوير الآداري.

بـنكەی كوردی بۆ لێكۆڵینەوەی ستراتـیـژی.

٥- بانكەكان وكێڵگە كشتوكاڵییە فراوانەكان و كارگە پیشەسازییە بەناوبانگەكان

وەك/ البنك المركزي العراقي.

٦-مزگەوت و كەنیسە و شوێنە پیرۆزەكان.

Church of London

وەك/ مسجد مكة المكرمة یان

* نامە رەسمییەكان، كە لەلایەن سەرۆكی وڵات و پاشاكانەوە دەردەچن:

١-بە ناوی وڵاتەكە، دواتر سیفەتی كەسەكە، دواتر ساڵی لەسەر كارلادان و دواتر ناوی كەسەكە لەنێوان دوو كەوانـــەدا.

عێراق. سەرۆك، ٢٠٠٥-(جەلال تاڵەبانی)

السعودیة. ملك، ١٩٦٤ — ١٩٧٥ (فیصل بن سعود)

Gt.brit. sovereign, 1952. 1965 (Elizabeth II)

٢-ئەو بڵاوكراوانەی كە نووسەرەكانیان سەرۆكی وڵاتن یان پاشاكانن راستەوخۆ بەناوی سەرۆكەكە یان پاشاكـــە دەبـێـــت.

أنور السادات، رئیس جمهوریة مصر العربیة.

قصة الثورة كاملة.

* یاساو رێسای وڵاتەكان، القوانین و الانظمة، راستەوخۆ لەژێر ناوی وڵاتەكان پێرست دەكرێت، دواتر و وشەی یاسای بۆ زیاد دەكرێت بۆ نموونە/ العراق . القوانین و الانظمة

العراق. الدستور

* هەروەها كارەكانی دادگاش راستەوخۆ لەژێر ناوی وڵاتەكە پێرست دەكرێت دواتر ناوی دادگاكە

العراق محكمة التمیز

* کـاری سـەفارەتەکانیش راسـتەوخۆ لـەژێر نـاوی وڵات دواتـر نـاوی سـەفارەتەکە پێڕست دەکرێت

بۆ نموونە/ مصر . السفارة المصرية (العراق)

* کاروباری کۆنگرەو کۆنفرانس و کۆبوونەوە گشتییەکان .

ئەمەش ئەو کارانە دەگرێتـەوە، کـە کۆمـەڵێك پسـپۆڕ لـە بـواری سیاسـی، ئـەدەبی، فەرهـەنگی زانسـتی، کۆببنـەوە بـۆ تـاوتوێکردن و بڕیـاردان لەسـەر بابـەتێکی گـرنگ. راستەوخۆ ئەم کارانـە لـەژێر نـاوی کۆنگرەکـە پێڕسـت دەکرێـت، دواتـر ژمـارەو مێـژوو شوێنی بەستنی کۆنگرەکە دەنوسێت.

المؤتمر العلمي العلمي الاول للجنة العامة الذرية العراقية،

بغداد، ١٩٧٥

المؤتمر المكتبي الاول، بغداد، ١٩٧٤

مؤتمر المنظمات الاسلامية، مكة المكرمة، ١٩٧٤

کۆنفرانسی یەکەمی کتێبخانەو زانیارییەکان، هەولێر، ٢٠٠٦

* پەیماننـامەو پەیوەست نامەکان

کاروباری پەیماننـامـەو پەیوەسـت نامـەکان لـە نێـوان وڵاتانـدا، لـەژێر نـاوی وڵاتـدا پێڕست دەکرێت بۆ نموونە/ العراق. معاهدات،الخ ......

کوردستان. پەیوەست نامە،....هتد

ئەگەر پەیماننامـەیەك هەبوو لە نێوان دوو وڵاتـدا، ئـەوا بـە نـاوی ئـەو وڵاتـە پێڕسـت دەکرێت کە پەیماننـامەکەی تێدا مۆرکراوە.

العراق. معاهدات، الخ.... سورية، ١٩٧٢

U.S. treaties etc. Burma, June, 24, 1959

العراق . معاهدات، الخ... ايران ، اذار ١٩٧٥.

ئەگەر پەیماننامەیەك لە نێوان ولاتێك لە لایەك و چەند ولاتێکی تر مۆرکرا، ئەوا لە ژێر ناوی ولاتی یەکەم پێڕست دەکرێت. بۆ نموونە/ پەیماننامەیەك لە نێوان (فنلندا) لەلایەك و (بەریتانیا) لەلایەکی تر، ئەوا کارتی پێڕستکردنەکە بە ناوی (فنلندا)دەبێت، کارتی (ڕێگا نیشاندان) بۆ ولاتەکانی تریش دروست بکرێت.

Finland.treaties, etc.mar.27, 1961.

* G.T Brit.treaties, etc.Finland.mar.27, 1961

* پەیماننامەیەك لە نێوان سێ ولات و زیاتر لەژێر ناوی پەیماننامەکە، یاخود شوێنەکە کە پەیماننامەکەی لێ مۆرکراوە پێڕست دەکرێت. بۆ نموونە/

الامم المتحدة. معاهدات، الخ

الاتفاقية الدولية لازالة كافة اشكال التميز

العنصري- بيروت، ١٩٦٧ .

* کاروباری ڕێکخراوە ناحکومییەکان

وەك کۆڕو کۆبوونەوەو راپۆرت و بەڵگەنامەی بەڕێوەبردن، پەیڕەو و پرۆگرام، پڕوپاگەندە، لێکۆڵینەوە...هتد لەژێر ناوی ڕێکخراوەکەدا پێڕست دەکرێت وەك/

کۆمەڵەی کتێبخانەکانی عێراق

ئەو ڕێکخراوانەش کە نەناسراوون ناوی شار یاخود ولاتەکەیان بۆ دەنووسرێت وەك/

سەندیکای پارێزەران، بەغداد

ئەگەر نازناوی ڕێکخراوێك بەکورتکراوەیی هەبوو، ئەوا دەتوانین ئەو نازناوە بەکاربهێنین لەبری ناوە سەرەکییەکە بۆ نموونە/ اليونسكو

بدل

منظمة الامم المتحدة للتعليم و العلوم و الثقافة

Euraton

Not

European atomic energy community

## هەنـدێك نموونـە لەسـەر چـۆنییەتی پێرسـتكردنی بڵاوكـراوە حكـومی و ڕێكخراوەییەكان

العراق. السفارة (باريس)
تاريخ العراق المعاصر-
باريس: السفارة، ١٩٨٠ .
٢٤٢ ص
١- العراق - تاريخ ا- العنوان

العراق . المجلس الوطني
تاريخ العراق المعاصر .
بغداد: المجلس، ١٩٨٠ .
٢٤٥ ص
١- العراق - تاريخ ا - العنوان

**العراق. دستور**

**الدستور المؤقت–**

**بغداد: دارالحرية، ١٩٨٠ .**

**٢٢١ ص**

**١– العراق – الدساتير . ا – العنوان .**

**العراق. المواثيق**

**الميثاق العراقي.-**

**بغداد: دار الهيثم، ١٩٨٠ .**

**٢٢١ ص**

**١– العراق – المواثيق . ا– العنوان .**

العراق – القوانين و الانظمة...الخ
القانون العراقى الجنائي–
بغداد: دار المثنى، ١٩٨٥.
٣٤١ ص
١– العراق – القوانين و الانظمة ا – العنوان

المؤتمر الجيولوجين، التمهيدى، جمعية الجيولوجيين العراقيين –
بغداد. ١٩٧٢ .
بغداد: الزوراء، ١٩٧٢ .
١٥٦ ص
١– الجيولوجيا – المؤتمرات – العراق ا – العنوان.

العراق. معاهدات و الاتفاقات...الخ فرنسا
بروتوكولات التعاون بين العراق و الفرنسا
بغداد: الجاحظ، ١٩٨٠ .
٣٢٥ ص
١- العراق. معاهدات و اتفاقات . ا - العنوان .

المجمع العلمي العراقي
مصطلحات مقاومة المواد وهندسة اسالة الماء-
بغداد: المجمع، ١٩٦٧ .
١٩٠ ص، ١٢* ٢٤ سم
١- مقاومة المواد - المعاجم . ا - اسالة الماء - المعاجم.

العراق. وزارة النفط و المعادن

الكتاب السنوي: النفط والمعادن في العراق ١٩٧٣ .

بغداد: الوزارة، ١٩٧٣ .

٢٤٣ ص، ١٥ * ٣٠ سم .

١- النفط - العراق . ا - العنوان .

مصر. مصلحة الضرائب

دليل الضريبة العامة على الايراد-

القاهرة: الهيئة العامة لشؤون المطابع الاميرية، ١٩٧٣ .

١٥ ص، ١٢ * ٢٤ سم

١- الجرائب - مصر . ا- العنوان .

National glary of art
American paintings and sculpture:
An illustration catalogue.-
Washington: the glary, 1970.
192p.ill:23cm.
1-americanarts. Ii-title.

An illustration dictionary of geography /
Edited by R.ogilvie Buchanan.-
London: Heinemann education, 1974.
242p: ill.
1-phisical geographical-dictionary.
2-geography-dictionary.
I-buchanan, R.ogilive(Ed.)

## پێڕستکردنی ئەو سەرچاوانەی بەشێوەی زنجیرە دەردەچن (گۆڤار، ڕۆژنامە، ڕاپۆرت، ڕۆژ ژمێر..هتد - فهرست المسلسلات - الدوريات Serials, periodical

ئەو بڵاوکراوانە دەگرێتەوە، کە ناوبەناو لە ماوەی دیاریکراودا دەردەچن بەشێوەی زنجیرە، کۆمەڵێك بابەت و وتارو لێکۆڵینەوە دەگرێتەخۆ، چەندەها نووسەرو لێکۆڵەرەوە بەشداریانکردووە لە نوسینیدا. لەژێر یەك ناونیشانی یەکگرتوودا کۆبۆتەوەو بڵاوکراوەتەوە.

پێڕستکردنی ئەم سەرچاوانە جیاوازە لە پێڕستکردنی (کتێب)، چونکە لە پێڕستکردنی کتێبدا، دەروازەی سەرەکی کارتی پێڕستکردنەکە بە ناوی نووسەر یاخود هەرکەسێکی تر کە لەبری نووسەرێت دەبێت، بەڵام لەم جۆرە بڵاوکراوانەدا، دەروازەی سەرەکی بە ناونیشانی بڵاوکراوەکە دەبێت، زانیارییە بیبیلۆگرافیایەکان لە دوا ژمارەی بڵاوکراوەکە وەردەگرین.

ناونیشانی یاریدەدەر ناوی خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر لەمجۆرە بڵاوکراوانەدا نانوسرێت، چونکە ناوبەناو ئەوکەسانە لە گۆڕاندان.

هەروەها کارتی پێڕستی ئەمجۆرە بڵاوکراوانە هەندێك زانیاری تێدا تۆمار دەکرێت، کە لە پێڕستی کتێبدا نییە، وەك زنجیرە و مێژووی دەرچوون و چۆنییەتی دەرچوون و ئەو ژمارانەی کە لەناو کتێبخانەدا هەیە.

بۆجیاکردنەوەی کارتی پێڕستی گۆڤار لە کارتی پێڕستی کتێب، وا باشترە کارتی پێڕستی گۆڤار ڕەنگی (پەمەیی) بێت.

ئەو زانیاریانەی کە پێویستە لە کارتی پێڕستی بابەتە خولاوەکاندا تۆمار بکرێت بریتییە لە (ناونیشانی گۆڤار)، کە بەشێوەیەکی کورتکراوە دەنوسرێت، بە مەرجێك کار لە مانای گۆڤارەکە نەکات و دەستەواژەیەکی تەواو بێت. ناونیشانی یاریدەدەر ئەگەر زۆر گرنگ نەبێت گۆێی پێنادرێت و نانووسرێت. بەم شێوەیەی خوارەوە زانیارییەکان لەسەر پێڕستی گۆڤارەکان تۆمار دەکەین.

ژ. پۆلێن

ژ. تایبەت ناونیشانی گۆڤارەکە: شێوازی دەرچوونی/ئەولایەنەی کە دەری دەکات.-

ژمارەی یەکەم (ساڵ) - ژمارەی کۆتایی (ساڵ)-

شوێن: بلاوکەرەوە، ساڵ .

ژمارەی یەکەم: روونکردنەوە، قەبارە.

شێوازی دەرچوون .

١- سەرەبابەت

---

٠٥١

د ٢٢٣ الدارة: مجلة فصلية/ تصدر عن دارة الملك عبد العزيز-

ع ١ ( ١٩٧٥ ) - -.

الرياض : دارة الملك عبد العزيز ، ١٩٧٥ .

ع ١ : مص، ١٢*٢٤ سم .

فصليه .

١- الفلسفه- الدوريات - السعوديه .

٠٥١ الفلسفة – الدوريات – السعودية

د٢٢٣ الدارة: مجلة فصلية/ تصدر عن دارة الملك عبد العزيز–

ع ١ ( ١٩٧٥ ) –

الرياض: دارة الملك عبد العزيز، ١٩٧٥ .

ع ١: مص، ١٢*٢٤ سم .

فصلية.

١– الفلسفة– الدوريات – السعودية .

## هەندێك تێبینی لەسەر پێڕستکردنی گۆڤارو ڕۆژنامەکان

١- ئەگەر ناونیشانی گۆڤارەکە گۆڕدرا لە ناونیشانێکەوە بۆ ناونیشانێکی تر، ئەوا پێڕستکردنەکە بە ناونیشانە نوێیەکە دەبێت لەگەڵ دروستکردنی (کارتی ڕێگا نیشاندەر= بطاقة الاحالة)لە ناونیشانە کۆنەکە بۆ ناونیشانە نوێیەکە. بۆ نموونە/ مجلة السينما انظر مجلة السينما و المسرح .

٢- ئەگەر گۆڤارێك لە دەرچوون وەستا بوو، لە ماوەی دەرچوونیدا بە چەند ناونیشانێك دەرچوو بوو ئەوا ئەو ناونیشانە دەکەین بە دەروازەی پێڕستکردنەکە، کە بە زۆری گۆڤارەکەی پێناسرا بوو.

بۆ نموونە/ مجلة الاثنين و الدنيا – مجلة الاثنين.

٣- ئەگەر چەند گۆڤارێك لە چەند شوێنێکی جیاواز دەرچوون بە هەمان ناونیشان، ئەوا شوێنی جوگرافی زیاد دەکەین لەگەڵ ناونیشانی گۆڤارەکە لە نێوان دوو کەوانەدا دەنووسین ( ) .

بۆ نموونە/ الجمهورية (بغداد) الجمهورية (القاهرة).

٤- کاتێك کە گۆڤارێك لەلایەن ڕێکخراوێکەوە، یاخود دامەزراوەیەکی بەناوبانگەوە دەردەچێت، واباشترە دەروازەی سەرەکی بڵاوکراوەکە بەناوی ڕێکخراوەکەوە بێت، بۆ نموونە

مجلة جامعة المستنصرية/ جامعة المستنصرية، مجلة

Journal of the American chemical society

٥- ئەگەر گۆڤارەکە بەردەوام بوو لە دەرچوون ژمارەی یەکەمی دەنووسین دواتر نیشانەی ( - ) دادەنین، واتە بەم شێوەیە ع ١ -

٦- ئەگەر گۆڤارەکە وەستا بوو لە دەرچوون، ژمارەی یەکەم و مێژووەکەی، ژمارەی کۆتایی و مێژووەکەی تۆمار دەکەین. بۆ نموونە/ ژ ١ - (١٩٧٥) - ژ ٢٥ (١٩٨٠)

٧- ئەگەر لەناو کتێبخانەدا هەموو ژمارەکان نەبوو ئەوا لە شوێنی تێبینیدا تۆمار دەکرێت و ئاماژەی پێدەدرێت، یاخود (الفهرس المرئي).

٨- مێژوو تۆمار دەکرێت بە رۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ. ئەگەر رۆژانەبوو بە رۆژ، هەفتانە بوو بە هەفتە...هتد.

٩- ئەگەر گۆڤارەکە جگە لە ناوی دانەرەکەی ناونیشانی تری نەبوو ئەوا بە ناوی دانەرەکەی بلاودەکرێتەوە (کەس بێت یاخود رێکخراو).

١٠- ئەگەر ناونیشانی گۆڤارەکە ژمارەی لەگەڵدا بوو، لە ژمارەیەکەوە بۆ ژمارەیەکی تر گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەوا ژمارەکە نانووسین بۆ نموونە/ بلاوکراوەی ئیشی دەست ژمارە (٥)

دەبێت بە/ بلاوکراوەی ئیشی دەست

١١- ئەگەر پەرەی ناونیشان، ناونیشانی بلاوکراوەکەی بە چەند زمانێك تێدا بلاوکرابووەوە، ئەوا ئەو زمانە هەڵدەبژێرین کە دەقی بلاوکراوەکەی پێ بلاوکراوەتەوە.

١٢- ئەگەر ناونیشانی گۆڤارەکە بە شێوەیەکی کورتکراوە بوو، وا باشترە لەگەڵ ناونیشانە کورتکراوەکەدا، ناونیشانەکە بە درێژی بنووسرێت. بۆ نموونە/

**دفاتر م . ج . و . ع . ا . : دفاتر مركز جمع الوثائق للعلوم الانسانية .**

**هەندێك وشە كە بەكاردەهێنرێت بۆ دەربڕینی چۆنییەتی دەرچوونی گۆڤار، بە هەر سێ زمانی كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی**

| | | |
|---|---|---|
| daily | يومية | ڕۆژانە |
| Issued several times a week | تصدر عدد مرات في الاسبوع | چەند جارێك لە هەفتەیەكدا |
| Weekly | اسبوعية | هەفتانە |
| Biweekly | نصف الشهرية | نیو مانگی |
| monthly | شهرية | مانگانە |
| bimonthly | مرة كل شهرين | بە دوومانگ جارێك |
| quarterly | فصلية | وەرزی |
| 3no.ayear | ثلاث مرات بالسنة | سالی سێ جار |
| semiannual | نصف سنوية | سالی دوو جار |
| annual | سنوية | سالانە |
| biennial | مرة كل سنتين | دووساڵ جارێك |
| triennial | مرة كل ثلاث سنوان | سێ ساڵ جارێك |
| Frequency varies | غير منتظمة الصدور | دەرچوونی ڕێك و پێك نییە |
| Monthly except July and august | شهرية عدا تموز و اب | مانگانە بەلام جگە لە تەمووز و ئاب |

## هەندێك نموونە لەسەر چۆنییەتی پێرستكردنی گۆڤارەكان

٩٥٥,٠٥

د٢٤٤ دراسات ايرانية: (مجلة)/ تصدرها مركز دراسات

الايرانية جامعة البصرة- مج ١ . ع ١ ( ١٩٨٧ )-

(البصرة): المركز، ١٩٨٧ .

سنوية

١- ايران - تاريخ - دوريات

ا- جامعة الصرة - مركز دراسات الايرانية.

٠٥١

د٨٢٢ الوطن العربى: (مجلة)/ المشرف العام وليد

ابو ظهر- ع ١ ( ١٩٧٦ ) -

باريس، بيروت: (د . ن)، ١٩٧٦.

ع ١ : مص، ١٢*٣٠سم

اسبوعية

١- السياسة - الوطن العربى - الدوريات .

٠٥١

ي٣٥٤ يوميات ووثائق الوحدة العربية: (مجلة)/ تصدرها مركز دراسات الوحدة العربية– ع ١ (١٩٧٩)–

بيروت: المركز، ١٩٧٩ .

ع ١، ١٢ * ٢٧ سم

١– الوثائق العرية – دوريات.

ا– مركز دراسات الوحدة العربية.

709.567005
G

Gilgamesh: journal of modern Iraqi Arts / published by dar-almamun For translation and publishing.-
No.1 (1988) - .-
Baghdad: al dare, 1988.
No.1:illus.14*24c.
Yearly
1-iraq arts-periodicals.

## المخطوطات / دەستنووس manuscripts

بریتییە لە بابەتی رۆشنبیری، کە بەدەستووخەت نووسرابێت، دەکرێت نامە بێت یاخود بەڵگە نامە یاخود بابەتی زانستی و ئەدەبی و مێژووی ....هتد. ئەم بابەتانە پێویستیان بە لێکۆڵینەوە هەیە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری وەسفی لەسەر شێوازی دەرەوەی دەستنووسەکە، چونکە ئەم سەرچاوانە دەگمەنن دەکرێت لە هەموو جیهاندا یەك دانە لەو سەرچاوانە هەبێت، هەروەها لەسەردەمێکی کۆندا نوسراوە، بۆیە زۆرجار لاپەڕەکانی دەرەوەی سەرچاوەکە دەکرێت دڕابێت، یاخود نووسینەکانی تێکچوو بێت و لەلایەن کارمەندانی کتێبخانەوە نەخوێنرێتەوە.

بۆیە لەکاتی پێڕست و پۆلێنی ئەجۆرە سەرچاوانەدا دەبێت پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:-

١- هەندێکجار ناوی نووسەری سەرچاوەکە دیار نییە، یاخود زۆر دوورو درێژە یاخود نازناوی نووسەرەکە نووسراوە، بەڵام ناوی سەرەکی نییە، بۆ راستکردنەوەی ئەمانە پێویستە لەسەر پێڕست کار کە پشت ببەستێت بەو سەرچاوە باوەڕپێکراوانەی کە لەلایەن کسانی تایبەتمەندەوە بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکراون و بەسەرچاوەی یاداشت، یاخود ژیاننامە (تراجم)دەناسرێن.

٢- نووسینی مێژووی لە دایکبوون و مردنی نووسەرەکە لە تەنیشت ناوی نووسەرەکەوە لە دەروازەی سەرەکی پێڕستکردنەکە، کە لە رێگایەوە زۆرجار ساتی بڵاوکردنەوە یاخود نووسینی سەرچاوەکە دەزانین.

٣- ناونیشان بە هەمان شێوەی بڵاوکراوە چاپکراوەکان لەسەر دووری دووەم دەنووسرێن.

٤- شوێنی نووسین و نووسەرەوەکە (الناسخ) و مێژووەکەی لە هەمان شوێنی چاپ و بڵاوکەرەوەکەو ساڵی بڵاوکردنەوەکە دەنووسرێن.

٥- سەبارەت بە زانیاری لەسەر لاپەڕەکانی دەستنووسەکە، ئەوا یان بەشێوەی وەرەقـە کـە لەسـەریەك دیـوی نووسـرابێت، یـاخود بەشـێوەی لاپـەڕە و لەسـەر هـەر دوو دیـوی نووسراوە، شتێکی تر کە جێگەی سـەرنجە لـە دەستنووسـدا ژمـارەی دێڕەکـانی لاپـەڕەی دەستنووسەکە کە بە (مسـطرة)ناودەبرێـت، بـەم شـێوەیە دەنوسـرێت/ ٢١ ورقـة، ١٥ مسطرة.

هـەروەها لـە دوای لاپـەڕەکان جـۆری بـەرگ تێگرتنەکـە دەنووسـرێت ئایـا نـەخش و نیگاری تێدایە، یاخود بە ئاوی ئاڵتوون نووسراوە یاخود بەهەر شێوەیەکی تر.

٦- دوای (بیانات توریـق) وشەی دەستپێکردنی دەستنووسـەکە دەنووسـین کـە بـە (استهلال) دەست پێدەکات. واتە بەشێکی دەست پێکی دەستنووسەکە دەنووسین.

نموونە لەسەر المستهل/ اخبرنا عبدالله ابن المامون الهروي قال اخبرني ابي قال اخبرنا ابو عبدالله

نموونـة لەســەر الخاتمـة/ تمـت التفسـير الشـريف بعـون الله التعـالى في يـوم الخامس عشر من شهر ذي الحجة خمسين ومائة والف غير معروف تاريخ النسخ.

٧- المحتويات، ناوەڕۆك باس لە چی دەكات.

٨- بیانات المتابعة ، بـە هـەمان شـێوەی کتێـب، وەك سـەرەبابەت و ناونیشـانی سەرچاوەکە.

٩- دەروازەی سەرەکی کارتی پێڕست بـە نـاوی نووسـەر دەبێـت، بـەڵام ئەگـەر نـاوی نووسەر نەزانراو بوو ناوی ئەو کەسە دەنووسین، کە دەستنووسەکەی نووسیوەتەوە، یـاخود کۆکەرەوە، خۆ ئەگەر ئەوانەش نەزانراو بـوو ئـەوا کـارتی پێڕسـتکردنەکە بـە ناونیشـانی دەستنووسەکە دەبێت.

## چەند نموونەیەك لەسەر پێڕست و پۆلێنی دەستنووس

مخ
٩٣٥

٢٢٤١ ابن الربيع، عبد الرحمن بن على الشيبانى ، ٨٦٦-٩٤٤ ه
قرة العيون في تاريخ بلد الميمون/ نسخها عبدالله بن محمد
بن سليمان القرشي-
د.م: الناسخ، ١٢٢٢ه .
٢٤٦ ورقة، ١٤*٢١ سم
١٩ مسطر فى كل صفحة مصورة
١- الحضارة العربية. ٢- العرب - تاريخ
ب- العنوان.

مخ
٢٢٠

ف٤٢٣ الفيروز ابادي، محمد بن يعقوب بن محمد بن محمد بن ابراهيم بن عمر ٧٢٩-٨١٧ه

تنوير المقياس في تفسير سيدي عبد الله بن عباس -

د.م: د.ن، ١١٥٩ ه .

٨٢٨ ورقة، ١٢* ٢٣سم . م/ هب . ورق مقوي. ٢٣ مسطرة.

- اخبرنا عبدالله الثقة ابن المامون الهروي قال اخبرني قال اخبرنا ابو عبدالله...

---

- تمت التفسير الشريف بعون الله تعالى فى اليوم الخامس العشر من شهر ذي القعدة.

- المحتويات: هو رواية الكلبي ابى صالح ابي عباس في تفسير كتاب الله العزيز.

١ - القران الكريم - تفسير.    ا- العنوان .

مخ
٢٣٠

٥٣٢١ ابن الجزري، محمد بن محمد بن علي بن يوسف ٧٥١-٨٣٣ ه

الحصن الحصين من كلام سيد المرسلين/ نسخها

نفيس الدين العلوي-

قرطبة: الناسخ، ٨٧٢ .

٣٢٠ ورقة، نسخ، مجلد.

- فانه لما كان كتابي الحصن الحصين

من كلام سيد المرسلين فما اسبق الى مثله...

- سنة اثنين وسبعين وثمانمائة من الهجرة النبوية عليه

افضل الصلاة و السلام

- المحتويات جامع الاله عبد الغفار الواردة في الحديث.

١- الحديث الشريف - شرح.

ا- العلوي، نفيس الدين (الناسخ).

ب- العنوان.

## پێڕستکردنی نەخشەو ئەتڵەس و گۆی زەوی

## فهرسة المواد الخرائطية ( الخرائط و الاطالس )

## Cartographic materials (maps and atlases)

ئەمانەش کۆمەڵێك بابەتی رۆشنبیرین، کە زانیاریان هەلگرتووە، بەلاّم بە شێوەیەکی جیاواز تر لە کتێب و گۆڤارو دەستنووس، زانیارییەکانی ناو ئەم سەرچاوانە زیاتر بە شێوەی وێنەو نەخشەو هێلکارییە. کە بە هۆیەوە زانیاری دەبەخشێت لەسەر گۆی زەوی، ئەستێرەکان، ئاو، رووبار، بەرزو و نزمی، دانیشتوان، هەوا.....هتد.

لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری سەرچاوەکانی کتێبخانەش لەم جۆرانەن، بۆیە پێویستە پۆلێن و پێڕست بکرێن.

- دەستنیشانکردنی دەروازەی سەرەکی نەخشەو ئەتڵەس و گۆی زەوی

دوو جۆر بۆچوون هەیە بۆ دەستنیشانکردنی دەروازەی سەرەکی کارتی پێڕستی نەخشەو ئەتڵەس:-

یەکەم/ دەستنیشانکردنی دەروازەی سەرەکی کارتەکە بە ناوی ئەو کەسەی کە نەخشەکەی ئامادەکردووە، یاخود نەخشەکەی کێشاوە.

دووەم / بەلاّم زۆر لە زاناکانی بواری پێڕستکردن ئەم بۆچوونە بە هەڵە دادەنێن، بەپێی ئەوەی کە زاناکان لەسەردەمی کۆندا ئەو نەخشانەیان کێشاوەو ئەو کەسانەی دوای ئەمان تەنها نەخشەکانیان لەبەرگرتۆتەوە و جارێکی تر ئامادەیان کردۆتەوە.

هۆکارێکی تریش ئەوەیە کە زۆربەی خوێنەران نەخشەو ئەتڵەسەکان بە ناونیشانەکانیان دەناسنەوە و داوای دەکەن. زۆر کەم خوێنەر هەیە کە ناوی ئامادەکاری نەخشەکە بزانێت.

هەروەها بابەتی نەخشەکانیش زۆر جار لە یەکتر جیاوازن بۆیە واباشترە کە دەروازەی سەرەکی پێڕستکردن بەناونیشانی نەخشەکە بێت.

شوێنی دۆزینەوەی زانیاری لەسەر نەخشەیەك، پشتی نەخشەکە دەبێت، واتە زانیارییەکان لەپشتی نەخشەکە وەردەگرین.

## چەند نموونەیەك لەسەر پێڕستی نەخشەو ئەتڵەس

٩١٢,٥٦٧

ا ٨٧٤ الاطلس العراقي/ وزارة الثقافة والاعلام–

بغداد: الوزارة، ١٩٧٥ .

٢٠ ص : خرائط، ملونة، ٩*٢٠ سم

١– العراق – الاطالس .

٩١٢

ك ٢٣٢ كرة الارضية/ وزارة الثقافة و الالام –

مقياس الرسم ١ : ٢٠٠٠٠

بغداد: الوزارة، ١٩٨٠ .

١ كرة: ملونة، مجسمة .

١– العالم الكرات .

٩١٢,٥٦٧

خ ٢٢٨ خارطة العراق السياحية / اعداد وزارة الثقافة و الاعلام -
مقياس الرسم ١: ٣٠٠٠٠٠٠ -
بغداد: الوزارة، ١٩٨١ .
١ خارطة، ملونة، مجسمة، ١٥*٢٠ سم .
تطوى ٧ * ١٠ سم
١- العراق - الخرائط. ٢- العراق - السياحة.
ا- العراق. وزارة الثقافة و الاعلام.

٩١٢,٥٣١

خ ٢٢٨ خارطة المملكة العربية السعودية (خارطة)/ اعداد
وزارة الاعلام - مقياس الرسم ١ : ٣٠٠٠٠٠٠
الرياض: الوزارة، ١٩٨١.
١ خارطة: ملونة، ٣٨ * ٥٤ سم . على ورقة ٨١*٥٥ سم
تطوى فى ١٢*٢٠ سم . مع ٣٨ صورة تبين
نهضة السعودية.
بالمكتبة اربعة النسخ .
١- السعودية - خرائط . ٢- المواصلات - خرائط .

912
P Philip, George.
The university atlas / by George Philip.- 22nd.ed.-
London: George Philip, 1984.
176p.25*30c.m.
140p.index.
Geographical terms.
1-geographical mopes.
I-title.

## پێڕستی هۆکارەکانی بیستن و بینین
## فهرسة المواد السمعية و البصرية
## Audio visual material cataloging

هەموو کتێبخانەیەکی نوێ هەوڵدەدات کۆمەڵێك هۆکاری ڕۆشنبیر کردنی نوێ بەدەست بهێنێت و شانبەشانی کتێب و گۆڤار ببێتە هۆکارێك بۆ ڕۆشنبیر کردنی خوێنەران ، چونکە پێشکەوتنەکانی مرۆڤایەتی وا دەخوازێت کە شانبەشانی ئەو سەرچاوانە ، سەرچاوەی ئەلکترۆنیش لە کتێبخانەکاندا هەبێت . تاوەکو بە ئاسانترین شێوە و کەمترین ماوە زانیارییەکان بگاتە دەستی خوێنەران .

بۆیە لەم بەشەدا باسی پێڕست کردنی ( فلیم ، شریت ، سلاید ، وێنە ....هتد ) دەکەین .

شێوازی پێڕست و پۆلێنی سەرچاوەکانی بیستن و بینین زۆر جیاواز نین لە شێوازی پێڕست و پۆلێنی کتێب و گۆڤار ، تەنها ئەوەندە نەبێت کەمەندێك زاراوە بەکاردەهێنرێت لە پێڕستی هۆکارەکانی بیستن و بینین کە لە گۆڤارو کتێب بە کارناهێنرێت .

لەبەر ئەوەی زۆرجار کۆمەڵێك کەسایەتی بەشدارن لە ئامادەکردنی سەرچاوەکانی بیستن و بینین بۆیە واباشترە کە دەروازەی سەرەکی کارتی پێڕست کردن بە ناونیشانی سەرچاوەکە بێت ، واتە زانیارییەکانی تر لەسەر دووری دووەم دەنوسرێت .

## هەندێك نموونە لەسەر چۆنییەتی پێڕستكردن پۆلێنكردنی سەرچاوەكانی بیستن و بینین

٠٠٤
م ٢٩٣ ما هو الكومبيوتر[فلم سينمائى] / انتاج و
توزيع شركة الفديو المحدودة.–
لندن: الشركة، ١٩٧٩ .
١ بكرة (١٨ د): ملونة، ناطقة، ١٦ ملم
وضع خصيصا لتدريب العاملين مع الكومبيوتر
لاول مرة بللغة الانكليزية .
١– الحاسب الالكترونى. ا – شركة الفديو المحدودة (لندن).

ت ص
٢١٠
ق٢٢٨ قران الكريم [تسجيل صوتى] / تلاوة محمد الموسوي. –
قاهرة: اتحاد الاذاعة و تلفزيون، ١٩٧١ .
١ اسطوانة، (١٣ د. ق.): مجسم، ١٢ انج .
١– القران الكريم – تلاوة. ا– محمد الموسوي (القارئ).

ت.ص

٠٢٠

ع٧٢٥ العلاقات العامة و الدعاية المكتبية [تسجيل صوتي] / برنامج خاص اعداد محمود الاخرس، عدنان الشريف، اخراج احمد الدورى، تقديم ثابت عامر.-

السعودية: اذاعة المملكة العربية السعودية، ١٩٨٢ .

١ بكرة (٣١ د)٧,٥ انج/ ث، احادى .

يتكلم عن طبعة العلاقات العامة واصال المعلومات الى كافة الشرائح المجتمع.

١- المكتبات - العلاقات العامة. ا- الاخرس، محمود (معد). ب- الشريف، عدنان (معد). ج- الدورى، احمد (مخرج).

٩١٢,٥٦٧

خ ٢٢٨ خارطة العراق الزراعية [شفافية] / تصدرها

مدرية الوسائل التعلمية.–

بغداد: المديرية، ١٩٧٦.

١ شفافية: ملونة، ٣*٢٥ سم .

تبين المناطق الجغرافية ونوع المحاصيل التى

تزرع فى هذه المناطق.

١– الزراعة – العراق – الخرائط.

ا– العراق مدرية الوسائل التعلمية.

٤١٠,٧

ت ٢٧٥ تعلم اللغة العربية [بطاقة تعلمية] / اعداد

مديرية الوسائل التعلمية.–

بغداد: المديرية، ١٩٧٨.

٢٦ بطاقة: غير ملونة، ٩*١٢سم .

توجد فى البطاقة رسوم الاحرف العربية و كلمات .

١– اللغة العربية – التعليم .

ا– مديرية الوسائل التعلمية – بغداد (المعد).

٦١١
م٥٨٢ مقطع للاذن [نموذج] / اعداد
مديرية الوسائل التعلمية. —
بغداد: المديرية، ١٩٧١ .
١ نموذج: ملونة، ٣٢*١٢*٤ سم .
١- جسم الانسان - الاذن.
ا- مديرية الوسائل التعلمية - بغداد (المعد).

٣٩٨
ت٢٢٤ التراث الشعبي [مصغرات فلمية] / تصدرها
وزارة الثقافة و الاعلام.
بغداد: الوزارة، ١٩٦٩.
١٢بكرة مايكرو فلم: ديازو، ١٦ ملم .
١- الفولكلور . ا- العراق - وزارة الثقافة و الاعلام (المعد)
.

٩١٥,٦
و٨٨٢ الوطن العربي [مواد المجمعة] / اعداد

مديرية الوسائل التعلمية.

بغداد: المديرية، ١٩٨٧ .

٣ خرائط، ٤٥ سلايد، ١٢ صورة، ١٥*٢٢*٩ سم .

معهم دليل المعلم موضوع بالعلبة.

١- الوطن العربى - الوسائل التوضحية .

ا- بغداد - مديرية الوسائل التعلمية.

٧٠٩,٠٢
ف٨٣٦ فن التصوير الاسلامي [صورة] / اعداد

الواسطي.

الكويت: الممالك، ١٩٨٠ .

١صورة: ملونة، ٦٠*١٥ سم .

لوحة للفنان الواسطي، القرن ١٣ .

١- الفن الاسلامي. ٢- التصوير الاسلامي.

ا- الواسطي (الرسام).

٣٦٠

ر٢٣٣ رؤوف عبيد.

جرائم التزيف و التزوير [مايكروفيش] / تاليف رؤوف عبيد

القاهرة: دار الفكر العربي، ١٩٧٨ .

٣ مصغرات بطاقية: ملونة، ١٠*١٥ سم

تحتوي على الكشاف .

١- الجريمة و الاجرام. ا- العنوان.

٨١٠

م٥٢٥ مقامات الحريري [فلم تلفزيوني] / انتاج مؤسسة تلفزيون الاردني.

عمان: المؤسسة، ١٩٧٢ .

١ فلم (٣٠ د.): ملونة، ناطق، ١٦ ملم .

١- الادب العربي - مقامات.

ا- عمان - مؤسسة تلفزيون الاردني.

٧٠٠

ض٣٢٧ الضوء الخافت[ فلم سينمائي] / افلام
احمد مظهر، اخراج فطين عبد الوهاب.
لندن: توزيع متروكولدين ماير، (د.ت).
١ فلم (١٠٠ د): اسود وابيض، ناطق، ١٦ ملم .
١- فلم سينمائي. ا- احمد مظهر (منتج)
ب- فطين عبد الوهاب (مخرج).

٥٩٠

ح٤٣٢ الحيوانات الشتاء[عرض مرئي]/ انتاج
و توزيع المؤسسة العامة للتعليم العربي.
قاهرة: المؤسسة، ١٩٧٥ .
١ فلم ثابت (١٥د. ): ملونة، صامت، ١٦ ملم .
١- الحيوانات، علم . ا- مصر - المؤسسة العامة للتعليم .

ت.ص
٣٣٠
ش٢٣٢ الشروان، احمد صالح .
الكويت قبل النفط [تسجيل صوتي] / اعداد
احمد الشروان، القاء سمير الصبري .
القاهرة: المشروع التاريخي للوطن العربي، ١٩٨٣ .
١ كاسيت (٣٠ د.ق.): مساران، احادي .
يستعرض ذكريات احد كبار المعمرين في الكويت .
١- الكويت - الاقتصاد . ا- سمير صبري (ملقي).
ب- العنوان.

ت.ص
٧٨٠
ك ٧٤٣ كيلوباترا [تسجيل صوتي] / تلحين و غناء
محمد عبد الوهاب، تاليف علي محمد طه -
القاهرة: صوت الفن، ( ).
١ اسطوانة، (١٣ د. ق): ٣/ ١ ٣٣ د. ق، مجسم، ١٢ انج .
١- الاغاني المصرية. ا- محمد عبد الوهاب (ملحن).
ب- علي محمود طه (تاليف).

# سەرچاوەکان


١- الامين، عبدالكريم... واخرون. مبادئ الفهرسة و التصنيف . ج ١ . بغداد: دار الحرية، ١٩٧٩ . ٣٩١ ص .

٢- الامين، عبدالكريم... واخرون . مبادئ الفهرسة و التصنيف . ج ٢ . بغداد: دار الحرية، ١٩٨٠ . ٢١٩ ص .

٣- الحلوجي، د. عبد الستار . لمحات من تاريخ الكتب و المكتبات . القاهرة: دار الثقافة، ١٩٩١ . ط ٣ . ١١٣ ص .

٤- رنجاناثان، ش . ر . ر. ترجمة حسن علي حسن حلوة. مبادئ تصنيف المكتبات . رياض: دار المريخ، ١٩٨٦ . ٢٦٩ ص .

٥- شرف الدين، عبد التواب . التصنيف: دليل عملي و دراسات نظرية. القاهرة: الدار الدولية، ١٩٩٩ . ٢٣٩ ص .

٦- شرف الدين، عبد التواب. الفهرسة الوصفية . القاهرة: دار الدولية، ٢٠٠٠ . ٢٤٧ ص .

٧- العايدي، محمد عوض . الموسوعة في التصنيف العشري . القاهرة: المكتبة الاكادمية، ٢٠٠٠ . ٤ اجزاء .

٨- عبدالله مشعل عبيدات... و اخرون . اسس الفهرسة و التصنيف . عمان: دار المسيرة، ٢٠٠٢ . ٢١١ ص .

٩- عزام، برجيس . مدخل الى علم التصنيف في المكتبات. (د. م ): (د . ن)، ١٩٨٦. ٢٠٤ ص .

١٠- غنية خماس صالح . الفهرسة الوصفية: علم وفن و تنظيم . بغداد: مطبعة شفيق، ١٩٧٦ ص ٢٢٧ .

١١-    هنتر، ايريك . ج . تعريب و اعداد جمال الدين محمد الفرماوي . تحسيب عمليات الفهرسة في المكتبات و مراكز المعلومات . رياض: دار المريخ، ١٩٩٢ .

١٢-    هيسل، الفرد. تاريخ المكتبات . ترجمة د. شعبان عبد العزيز خليفة . القاهرة: المكتبة الاكاديمية، ١٩٩٣ . ١٩٨ ص .

13-Dewey, Melville. Dewey decimal classification and relative index ed.22.dublin:o.c.l.c., 2003. 4 volumes.

- شێرزاد سعید محمد.
- لەدایك بووی ١٩٦٧ سلێمانی.
- بەکالۆریۆس لە زانستەکانی کتێبخانە و دۆکۆمێنت.
- زانکۆی بەسرە بە پلەی (زۆر باش) ساڵی ١٩٩٠ – ١٩٩١.
- لە ساڵی ١٩٩٢ بەشداریکردووە لە دامەزراندنەوەی کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سلێمانی وەك خۆبەخش.
- ساڵی ١٩٩٣ تا ١٩٩٩ یاریدەدەری ئەمیندارى گشتی کتێبخانەو سەرۆکی بەشی (فەرهەنگ و پۆلین و خواستن بووە)لە زانکۆ.
- وەك مامۆستا بەشداری وانە وتنەوەی کردووە لەم خولانەدا:-

- ساڵی ١٩٩٦ خولی راهێنانی مامۆستایانی خوێندنگای ناوەندی و دواناوەندییەکان لە بواری زانستی کتێبخانەدا.
- ساڵی ٢٠٠٣ خولی فێربوونی زانستی کتێبخانە بۆ فەرمانبەرانی کتێبخانەکانی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری.
- ساڵی ٢٠٠٤ خولی فێربوونی زانستی کتێبخانە بۆ فەرمانبەرانی سەرجەم کتێبخانەکانی حکومەتی هەرێم لە پەیمانگای تەکنیکیدا.
- ساڵی ٢٠٠٤ وەك ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر بەشداریکردووە لە دامەزراندنی بەشی زانیارییەکان و کتێبخانە لە پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی لەو بەروارەوە مامۆستای وانە بێژە لە هەمان بەش.
- ساڵی ٢٠٠٥ خولی فەرمانبەرانی کتێبخانەکانی زانکۆی سلێمانی لە کتێبخانەی ناوەندنی زانکۆدا.

ساڵی ٢٠٠٨ خولی فێربوونی زانستی کتێبخانە بۆ سەرجەم فەرمانبەرانی کتێبخانەکانی شاری

- سلێمانی کە لە کتێبخانەی گشتی شاری سلێمانی کرابووەوە

- خاوەنی چەندەها نوسین و وەرگێڕانە لە گۆڤارو رۆژنامەکانی وەك (کوردستانی نوێ، ئاڵای ئازادی، هەرێم، زانستی سەردەم، دژنبست، ئاسۆی کتێبخانە)٠ کە بابەتەکانی تایبەت بە زانستەکانی کتێبخانە بووە ٠
- هەروەها بەشداریکردووە لە چەندەها سیمینار، چاوپێکەوتنی رادیۆیی و تەلەفیزیۆنی کەسەرجەم بابەتەکان تایبەت بوون بە لێدوان لەسەر زانستی کتێبخانەو کێشەکانی.
- ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری رێکخراوی (کۆمەڵەی کارمەندانی کتێبخانەکانی کوردستانە).
- لە ٩ / ٩/٢٠٠٧ بە زۆرینەی دەنگ وەك سەرۆکی کۆمەڵەی کارمەندانی کتێبخانەکانی کوردستان هەڵبژاردراوە٠
- (ئەندامی کارا) لە سەندیکای رۆژنامە نووسانی کوردستان و فیدراسیۆنی رۆژنامەنوسانی جیهان.
- ئێستاش مامۆستایە لە پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی بەشی کتێبخانە و زانیاری مامۆستای وانەی پێڕست و پۆلینە٠
- هەروەها یاریدەدەری سەرۆکی ئەمینداارانە لە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی و سەرۆکی بەشی فەرهەنگ و پۆلین٠
- بەشداریکردووە لە خولی مەشق و راهینان بۆ وەرگرتنی زانیاری نوێ لە بواری پێڕست و پۆلین کە لە زانکۆی سلێمانی کرابوە لە مانگی ئازاری ٢٠٠٨، خولەکە لەلایەن زانکۆی کورردستانەوە سەرپەرشتی دەکراو، چەند مامۆستایەکی ئەمەریکی لە بورای زانستی کتێبخانەدا وانەیان تیدا وتۆتەوە.

- وەك مامۆستا بەشداریكردووە لە وتنەوەی وانەی (پۆلین) لەو خولەی كە رێكخراوی كۆمەڵەی كارمەندانی كتێبخانەكانی كوردستان، بەهاوكاری وەزارەتی پەروەردەی حكومەتی هەرێمی كوردستان، بۆ ئەو فەرمانبەرانەیان كردبووە، كە لە كتێبخانەی قوتابخانەكانی پەروەردەی شاری سلێمانیدا كاردەكەن. لەماوەی نێوان ٩-١١-٢٠٠٨ بۆ ٣٠-١١-٢٠٠٨ . خولەكە لە مەڵبەندی راهێنانی مامۆستا بەرێوەچوو.

فەرهەنگێكی لەبواری كتێبخانەو زانیارییەكاندا ئامادەكردووە، بە هەرسێ زمانی ئینگلیزی و عەرەبی و كوردی، بە تاكە فەرهەنگ دادەنرێت لەم بوارەدا كە زاراوەكانی تێدا بێت بە زمانی كوردی.

## ناوەرۆك

پاری سێیەم/ پێڕست